

ئەنستاس ماری کەرمەلی

# کتێبی ئێزیدیەکان (جیلوه و مەسحەفا ڕەش) و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی




فەرهاد عەبدوللا

لە فرەنسیەوە کردوونی بە کوردی،
پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیون

زنجیرەی
کتێبخانەی کوردناسیی
(4)

کتێبی

# ئێزیدیەکان

## ( جیلوە و مەسحەفا ڕەش )

و

## بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی

نەجاتی عەبدوڵڵا

لە فرانسییەوە کردوونی بە کوردی،
پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوون

٣,٢٩٥

ك ٢٥٩ كەرمەل، ئەنستانس ماری

کتێبی ئێزیدییەکان و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی/ دانانی ئەنستانس ماری کەرمەل"

وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵڵا.

سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.

٢٦٨ل: وێنە، نەخشە، بەڵگەنامە، پاشکۆ، (١٤,٨٥ × ٢١ سم).

١- ئێزیدی، دین- مێژوو ٢-ئێزیدی- بیبلیۆگرافیا ٣- جیلوەو مەسحەفا ڕەش

د- ناونیشان ب- نەجاتی عەبدوڵڵا (وەرگێڕ)

کتێبخانەی گشتی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی پێڕست و پۆلێنی ئامادە کردووە

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

**زنجیرە: ٤٢**

**کتێب: کتێبی ئێزیدییەکان و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی**

**دانەر: ئەنستانس ماری کەرمەل**

**وەرگێڕ (لەفرانسییەوە): نەجاتی عەبدوڵڵا**

**بابەت: مێژوو و ئیتنۆگرافیا**

**تایپ و مۆنتاج: وەرگێڕ**

**بەرگسازی: قادر میرخان**

**خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید**

**تیراژ: ١٠٠٠**

**شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان**

**ژمارەی سپاردن: ٦٨٥ی ساڵی ٢٠٠٦**

لە بڵاوکراوەکانی

**بنکەی ژین**

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستانی عێراق- سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی ، کۆڵانی٢٩، خانووی ژمارە ١٠،

( بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتایی ئەردەڵان )

تەلەفۆن: ٣١٠٦١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سندووقی پۆست: ١٤

E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com

## پشکەشـــــە بـــــە :

- گیانی پاکی هەموو ئەو ئێزیدییە بێگوناهانەی

هەر تەنها لەبەر ئێزیدی بوونیان

بە دەست سوپای داگیرکاران و میر و

بەگە کوردەکان شەهید کران،

- بەوانەی کولتوور، مێژوو و ترادسیۆنی

ئێزیدیاتی دەپارێزن

دیاری و پێشکەشـــــــــــــــە

# پێشەکی

خوێنەرە خۆشەویستەکانم،

یەکێك لە سیما هەرە زەق و دیارەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری دیاردەی فرە ئایینی و فرە مەزهەبییە کە بەداخەوە ئێمە بۆ خۆمان وەك کورد هەر زۆر کەم بایەخمان بەم لایەنە داوە. یەکێك لەو کۆمیۆنیتە کوردانەی کە بێگانەکان بایەخی یەکجار زۆریان پێداوە کە ڕەنگە لە هەموو تایەفە و فیرقە ئایینیەکانی دیکە زیاتر سرنج و تێبینی بێگانەکان، بە تایبەت ڕۆژئاواییەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا بێ، ئێزیدیەکان بن. بە پێچەوانەشەوە ڕەنگە ئەوەی لە هەمووان کەمتر سرنج و تێبینی کورد خۆیی ڕاکیشابێ، بواری ئایینی بە گشتی و بواری ئێزیدیاتی بێ بە تایبەتی. ڕەنگە ئەمە تاکە یەك شتمان پێبڵێ ئەویش ئەوەیە بە ڕاستی بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە ناو ئێمەدا هێندە لە دواوەیە کە هەر هەست بە بوونیشی ناکرێ. ئێمە ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستمان بەوەیە چەند ناوەندێکی تۆژینەوەی زانستی تایبەت بە ئێزیدیناسی لە یەك یا دوو زانکۆی کوردستان بکرێتەوە و کادر و پسپۆری تایبەتی بۆ تەرخانبکرێ و

هەوڵبدرێ هەموو ئەو نووسین و کتێبانەی لە بارەی ئێزیدیەکانەوە نووسراون بە هەر زمانێك بێ کۆبکەنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و تێبینیان لەسەر بنووسن و کار لەسەر لایەنە تاریك و حەشارگە زۆر و زەوەندەکانی ئەم ئایینە ڕەسەنەی کورد بکەن. ئەم ناوەندە زانستیانە دەتوانن دەیان و سەدان ئینسیکلۆپیدیای نایاب تایبەت بەم ئایینە ڕەسەنەی کورد بڵاوبکەنەوە.

خوێنەری خۆشەویست،

ئەم کتێبەی بەردەستتان بەرهەمی کارکردنی پچڕ پچڕی چەند ساڵێکە و وا ئەمڕۆ خۆشبەختانە ڕوناکی بڵاوکردنەوی بینی و زۆریش بە هیوام ئەم کتێبە ببێتە هاندەرێك بۆ ئەوەی زۆر لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی زانستی دیکەی بە دوا دا بێت. سەرەتای ئەمکارە تەنها وەرگێڕانی وتارەکەی ئەنستانس ماری کەرمەلی[1] بوو، کە ساڵی 1911 لە *گۆواری نێونەوڵەتی ئیتنۆلۆژی و زمانەوانی*[*] Anthrops بەرگی شەشەم، لە ڤیەننا- نەمسا بڵاوکرایەوە. ئەم وتارە دەمێك بوو سرنجی منی بۆ خۆی ڕاکێشابوو. خودا کاری کەرمەلی ڕاست بکات - ئەگەر ئەمکارەی بە هەر پشتە نیازێکەوە کردبێ - ئەمڕۆ گەنجینەیێکی بێهاوتای بۆ بەجێهێشتین کە ئەویش تێکستی ئەسلی کوردیی هەردوو کتێبی جیلوە و مەسحەفا ڕەش -ە بە ئەلفبێ ی تایبەتی کوردی. ئێستە کە ئێمە سەرلەنوێ وتارەکەی کەرمەلی - مان لە فرانسەرییەوە کردووە بە کوردی و هەردوو تێکستی کتێبە

[1] بۆ دەقی تەواوی گوتارەکە بە فرانسی بڕوانە: Anastase-Marie, O. Carm., *La découverte récente des deux livres sacrés des Yêzîdis*. In Anthropos, t. VI, N° 1. Janv-févr.1911, pp. 1-39

[*] *Revue Internationale d'Ethnologie et linguistique*

پڕۆژەکانیشمان هێنایەوە ناو کتێبخانەی کوردی و بۆ بەردەستی خاوەنی خۆی، زۆر بە هیوام پسپۆر و شارەزایەکانمان لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی جیاوازی جیاوازی بۆ بکەن و مەلۆی دیکە بخەنە سەر ئەم کارە و دەوڵەمەند تری بکەن. زۆریش لە نووسیار و لێکۆڵەرەوە ئێزیدییەکان خۆیان دەپارێمەوە کە ڕەنگە ئەوان باشتر بۆیان مەیسەر بێ بە شوێن ئەم زانیاریانە دابچن کە کەرمەلی تۆماری کردوون و شایەد ئەم وتارە زۆر شتی شاراوەمان بۆ بدۆزێتەوە یان هەر هیچ نەبێ سەرەداوی بڕێك لە حەشارگەکانمان بۆ سەرواڵا بکات. حەزدەکەم ئەوەش بڵێم کە نە ئەنستانس ماری کەرمەلی و نە دکتۆر بیتنەر و نە هیچ کەسێکی دیکە تا ئێستە کاریان لەسەر تێکستە کوردییەکانی ئەم دوو کتێبە نەکردووە و هەموو ئەوانەی لەم بوارەدا کاریان کردووە، لێکۆڵینەوەکانیان تەنها لەسەر تێکستە وەرگێڕاوە عەرەبییەکان بووە. ئێستە کە تێکستە کوردییەکان وا لەبەر دەستدان هەقە توێژەرەوەکانمان کار لەسەر ئەم تێکستانە بکەن و خوێندنەوە و لێکدانەوەی نوێیان بۆ بکەن. هەر لەگەڵ ئەم کتێبە بە باشمان زانی ئەو بیبلیۆگرافیایەی کە چەندین ساڵە لە بارەی ئێزیدیاتییەوە سەری پێکردوین بە هەموو قوژبن و کەلێنی کتێبخانە گەورەکانی پاریس و لەندەن لەگەڵ ئەم کتێبە بەیەکەوەی بڵاوبکەینەوە، هەر لەگەڵ ئەم کتێبە چوار پاشکۆمان کردە پاشبەندی کتێبەکە، یەکەمیان سکاڵانامەکەی شێخ و پیاو ماقوڵانی ئێزیدیان بۆ دەسەڵاتکارانی عوسمانی ساڵی 1872 لە سەردەمی سولتان عەبدولعەزیز، کە لە ئەستەمبوڵەوە ژێنراڵ موحەمەد تاهیر بەگ دەنێرنە موسڵ تا 15000

سەربازی ئێزیدی کۆبکاتەوە[2]. ئێزیدیەکان لە سۆنگەی ئیلتیزاماتی ئاینییانەوە داوای بەخشینیان دەکەن لە خزمەتی سەربازی. ئەم سکاڵانامەیە ئێستە لە کتێبخانەی Preusisch Staatsbibliothek بە کۆدی Fol. 37 پارێزراوە. ئێمە ئەم سکاڵانامەیەمان لە گۆواری کۆمەڵەی مێژوونووسانی ئەڵمانی[3] وەرگرت کە کاتی خۆی لە دەستنووسێکدا ساڵی 1883کە بە کۆششی پرۆفیسۆر Sachu و لەسەر میزانییەی کەسیی قەیسەری ئاڵمان بۆ کتێبخانەی بەرلین کڕابوو و وتارەکە ساڵی 1897لە لایپزیك لە ژمارە 51 ی گۆواری ناوبراو بڵاوکراوەیەوە. دووەمیان دەقی نوێژی ئێزیدییەکانە کە ساڵی 1933 لە شام لە لایەن جەلادەت ئالی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە. سێیەم: بە پێویستمان تێکستی عەرەبی و کوردی هەردوو کتێبەکە کە کاتی خۆی ئەنستانس ماری کەرمەلی کاری لەسەر کردووە و دوایی داویەتی بە دکتۆر ماکسیمیلیان بیتنەر و تەرجەمەی ئەڵمانی کردووە بکەینە پاشکۆی ئەم کتێبە ودواجاریش کۆمەڵێك بەڵگەنامەی بڵاونەکراوەی تایبەت بە ئێزیدییەکان بوو کە لە ئەرشیفی وەزارەتی سوپای زەوی فرانسا[4] لە پاریس وەرمانگرتووە و بۆ یەکەمجار لەگەڵ ئۆریژیناڵە فرانسەوییەکان، وەرگێڕانە کوردیەکەشمان بڵاوکردۆتەوە.

---

[2] بڕوانە Nau, F and J. Tfinkdji, *Recueil de textes et de documents sur les Yezidis,* In Revue de l'Orient Chrétien, 2nd séries, vol. 20, 1915-17, p. 168.

[3] *Zeitschrift der Deutschen Morgenländischen Gesellschaft*

[4] تەواوی ئەم دەکۆمێنتە کە ئێستە لە کۆشکی ڤانسێن Château de Vincennes پارێزراون لەم سێ کارتۆنە وەرگیراون:

1- 7N 4172, 7N 4174 et 7N 1648

دواجار ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم ئەم کتێبە بەو نیازە ئامادەکراوە بەشدارییێکی بچوک بێ لە توژینەوەی ئێزیدیناسی و هاندەرێکیش بێ بۆ زۆر لێکۆڵینەوە و بەشوێن داچوونی زانستیانەی دیکە.

نەجاتی عەبدوڵڵا

پاریس، شەوی 21ی تەمموزی 2006

# کورتە باسێکی ئێزیدیناسی

ئێزیدی: ئاینێکی کۆنی یەکتاپەرستییە monothéiste و لە هەمان کاتیشدا ناوی گروپێکی ئیتنیکیشە. دەرکەوتنی وەکو ئیتنیەکی سەربەخۆ دیاردەیەکی ئاڵۆزە کە بە گوێرەی گێڕانەوە ئێزیدییەکان مێژووی وەدیارکەوتنی ئیتنۆگنێزی ethnogenèse ئێزدیایەتی دەگەڕێننەوە بۆ سەدەی سێیەمی پێش زاین و بە گوێرەی سەرچاوەی دیکە بۆ سەدەکانی دوانزەهەم و سێزدەهەم و برێکی دیکە بۆ سەدەی نۆزدەهەمی دەگێڕنەوە. سەبارەت بە بنەڕەتی ئێزیدیەکان زۆر بیرو ڕای جیاواز جیاواز هەیە، لای هەندێك ئێزیدی سەر بە ئایینی زەردەشتییە و لە برێك لە تێکستەکاندا پێوەندی نێوان میرێکی ئێزیدی بە دووەم پاشای ساسانییەکان، شاپووری یەکەم ( 243–273) باس دەکەن[5]. لای برێك سەرچاوەی دیکە ئێزیدیزم کارەکتەری سانکرێتی، ئیسلامی، مەسیحیایەتی و جولەکایەتی بەسەرەوەیە. بەلام تێزی هەرە بلاو و ناکۆکی ناو

---

[5] Planhol, Xavier de, *Minorités en Islam : Géographie politique et sociale,* Ed. Flammarion, Paris, 1997, p. 179.

زانایەکان بریتیە لە تێزەکەی کوردناسی فرانسەوی رۆژەر لیسکۆ و ئەکادیمی ن. مار. لای لیسکۆ، ئێزیدیاتی سەرچاوەی ئیسلامیی هەیە و ئێزیدیزم لە بنەڕەتدا لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە hérésie و دامەزرێنەرەکەی شێخ ئادی کەسایەتییێکی مێژوویی سەدەی دوانزەهەم بووە و سۆفیەکی تەواو ئۆرتۆدۆکسی (باوەڕقایمی) سوننی بووە بەڵام لە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا هەر زوو کۆمەڵێك ڕەگەزی دیکەی بەخۆوە گرتووە و دواجار بە تەواوی خۆی لە ئایینی ئیسلام جیاکردوتەوە[6]. بە گوێرەی تۆژەرەوەی فرانسەوی Michel Chevalier ئێزیدیاتی لە سەدەی سێزدەهەم و چواردەهەم ئایینی نەتەوەیی کوردستان بووە و لە ناو هۆزە گەورە جەنگاوەرە کوردەکانی بۆهتانی سەرووی دەجلە و شەنگالْ بڵاوبۆتەوە و دواتر بەرەو باکوور بۆ ناوچەکانی گۆلی وان و هەتاوەکو ئازەربایجان و بەرەو شاری خۆی هەڵکشاوە[7]. هەرچی ئەکادیمی ن.مارە ئەو لای وایە کە ئێزیدیاتی پاشماوەی ئایینێکی بتپەرستی کوردانەی پێش دەورانی ئیسلامەتییە[8].

---

[6] Michel Chevalier, *Les montagnards Chrétiens du Hakkari et du Kurdistan septentrional*, Ed. Publication du l'Université de Paris Sorbonne, Paris, 1985, p. 84

[7] Michel Chevalier, *Les montagnards Chrétiens du Hakkari et du Kurdistan septentrional*, Ed. de l'Université de Paris Sorbonne, Paris, 1985, p. 84.

[8] ا.م.مینتیشاشڤیلی، *کورد: کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتیی-ئابووریی، رۆشنبیری و گوزەران*، وەرگێڕانی لە رووسییەوە: د.عیززەدین مستەفا رەسوول، سلێمانی، ل: 75.

زۆربەی سەرچاوەکان وەدیارکەوتنی ئێزیدییەکان دەگێڕنەوە بۆ دەورانی شێخ ئادی کوڕی موسافیر ( دەوریەری 1075-1160). بەر لەو مێژوونووسیی ئێزیدیاتی هێندە هەژارە کە هیچ وردەکاریەکی دیکە لە هیچ سەرچاوەیەکەوە تا ئێستە لەبەردەستدا نییە. هیچ دوور نییە ئێزیدی بەر لە سەدەی دوانزەهەم هەبووبن یاوەکو بە ناوێکی دیکە هەبووبن بە جۆرێك وەکو ئیتنیێکی جیاواز نەناسرا بن. ئەوە تەنها لە دوای شێخ ئادی کوڕی موسافیر و بە تایبەتیش دوای شێخ حەسەن بوو کە ئێزیدییەکان وەکو ئیتنیێکی سەربەخۆ لە ناو سەرچاوەکاندا ئیشارەیان بۆ کراوە. بە گوێرەی سەرچاوە ئیسلامیەکان شێخ ئادی سۆفییەکی گەورە بووە و هەر چوار گۆشەی دونیا گەڕاوە و هاوسەردەم و ناسیاوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، سەهرەوەردی و حەلوانی بووە. بڕێك لە سەرچاوەکان شێخ ئادی بە عەرەب و بە خەڵکی بەعلبەگ دادەنێن کە لە لوبنانەوە هاتووە و لە لالش لە ناو کوردە ئێزیدییەکان جێنشین بووە. ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەوەی بڕێك لە سەرچاوەکان شێخ ئادی کوڕی موسافیر بە عەرەب و خەڵکی بەعلبەگ دادەنێن، لەوەوە بە هەڵە چوون چونکو دوو شێخ ئادی هەبووە. ئەوەی شێخی ئێزیدیەکان ناوی شێخ ئادی ابو المسافر ابن البرکات بووە و لە چیایەکانی هەکاری لە کوردستان لە دایکبووە[9] و هیچ پەیوەندیەکی بە لوبنان نەبووە و سۆفیەکی عەرەبیش نەبووە وەك بڕێك لە سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن. هیچ لۆژیك نییە و ڕێی تیناچێ سۆفیەکی عەرەب کە ڕەنگە یەك تاقە

---

[9] الامیر شرف خان البدلیسي، *شرفنامة*، ترجمة محمد جمیل الملا احمد الروژبیاني، الطبعة الثانیة، کردستان، 2001، ص: 53,

وشەی کوردیشی نەزانیبێ توانیبێتی لە ناو گروپێکی ئاوەها داخراوی وەك ئێزیدییەکان کە لە زمانی کوردی ( دیالێکتی کورمانجی) زیاتر یەك زمانی دیکە نازانن قسە بکەن و بە قسەی گیست تا سەرەتای سەدەی بیستەم تەنها یەك خوێنەواریان هەبووە کە مشووری کتێبی جیلوەی خواردووە[10] توانیبێتی ببێتە شێخ رۆحانی و فریشتەی ئێزیدیەکان. ئەگەر شێخ ئادی عەرەب بوایە ئەوا هەر هیچ نەبوایە کتێبی جیلوە کە زۆربەی سەرچاوەکان بە هی ئەوی دەزانن لە بنەڕەتدا هەر بە عەرەبی دەنووسرا نەك بە کوردی و دوایش وەرگێڕاوە عەرەبییەکەی هێندە بە زمانێکی عەرەبی شەق و شڕ تەرجەمە کراوە کە قەت وا پێناچێ ئێزیدیەکان رۆژێك لە ڕۆژان تەنانەت یەك عەرەبیشیان لە ناودا بووبێت.

## ئێزیدی و ئێزیدیزم

لە ناو لێکۆڵینەوە مێژوویەکاندا بە تایبەت لە سەرچاوە رۆژئاواییەکان زۆر واتە بۆ وشەی ئێزدی دانراوە. بڕێك ( لە فارسییەوە) بە واتەی ( فریشتە) یان لێکداوتەوە، بڕێك ( وەك لە پەهلەویدا ) بە واتەی ( لە خوا چوو) یان لێکداوەتەوە، یان هێندێکی دیکە ( لە سانکریێتیەوە) وەك واتەی ( شایستەی خزمەتکاری خودایی )یان لێکداوەتەوە. لای ن. مار وشەی (یەزیدی) لە وشەی ئێزدی پارسییەوە هاتووە کە واتەی ( خوا) دەگەیەنێ. پرۆفیسۆر

---

[10] Izady, mehrdad, *The Kurds: A Concise handbook*, Ed. Taylor & Francis, 1992, p. 156

Henri Karmen لای وایە وشەی ئێزیدی هەر تەنها وەك واتەی ( فریشتە پەرستان)  تەرجەمە دەکرێ نەوەکا وەك شەیتان پەرستان هەروەك ئەوەی لای موسلمانەکان وا هاتووە. ڕاستیەکەی ئەوەیە وشەی ئێزدی لە وشەی (ئیزی) یەوە ئەم ناوەی وەرگرتووە کە واتەی خودا یان خوداوەند دەگەیەنێ.

## ئێزیدی: ئامانجێك بۆ چەوساندنەوە

بە گوێرەی خوێندنەوەی سەرچاوەکان وادیارە بەلای کەمیەوە ئێزیدیەکان هەر لە دەورانی عەباسیەکانەوە تەنگیان پێهەڵچنراوە و ڕەدوو نراون. ئومەوییەکان لەبەر هەر هۆیەك بووبێت پارێزگاریان لە ئێزیدیەکان کردووە و لەم سۆنگەیەوە ئێزیدیەکان خۆیان بە لایەنگیری خەلیفە یەزد ژماردووە  و شێخی ئێزیدییەکان ڕێگەی  بە موریدەکانی نەداوە کەوا بە خراپە باسی یەزیدی کوڕی موعاویە بکەن*. دواتر لەوەوە بە هەڵە لەسەرچاوە عەرەبیەکاندا ناوی ئێزیدیەکان لە ناوی (خودا پەرستان) ەوە بوو بە الیزیدیە، واتە لایەنگیرانی یەزید. وەك جوگرافیناسی فرانسەوی Planhol زۆر جوانی بۆچووە کە ڕەنگە ناونانی  یەزیدی لەلایەن شیعەکانەوە ئەم ناوەیان بەبەریاندا بڕابێت کە تەواو ڕقیان لە خەلیفە یەزید

---

* بەداخەوە تا ئێستە مێژووی پێوەندییەکانی نێوان ئومەوییەکان و کورد هیچ لێکۆڵینەوەیێکی ئاوەهای بۆ تەرخانکراوە. باسێکی وەك کورد لە سەردەمی ئومەوییەکان لە هەموو ڕوویێکەوە شایانی چەندین لێکۆڵینەوەیە، وەرگێڕ.

دەبـوٚوە[11] لەگـەڵ سـەرەتای سـەدەی پانزەهـەم ئیـدی سـەرەتای چەوساندنەوە ئێزیدیـەکان دەسـتپێدەکات. سـاڵی 1415 مـیری جـەزیرەی سـوریا لەشکرکێشـی دەکاتـە سـەر ئێزدییـەکان و تـا تۆلێرانسی ئیسلامی بەرانبەر بە ئێزیدییەکان ئەوەندە زۆر بووە لەو لەشکرکێشیەدا گلکۆی شێخ ئادی هەڵدەتەکێن تا دواتر ئێزیدیەکان دووبارە دروستی دەکەنـەوە[12] دواتـر لەگـەڵ دەسـەڵات بەدەست گەیشـتنی عوسمانییـەکان دیـاردەی ئـەنتی ئێزیـدی و بەناچـاری ئیسـلامکردنیان فـرەوانتر دەبێـت و شـێوەیێکی سیسـتماتیك وەردەگرێـت.، بـە تایبـەت ڕەشـەکوژییەکانی سـەدەی حەڤدەهـەم، هەژدەهەم و نۆزدەهەم موچرك بە لەشدا دەهێنن. هاوکات لەگەڵ ئەم هێرشـانەدا مێـدیای عوسمـانی بـۆ ڕەوایـی دان بـە کوشـت و بـڕی ئێزیدییەکان ناوی (شەیتان پەرست) یان بە باڵای ئەم گروپەدا بڕی کە تا ئێستەکەش ئەم ناوەیان هەر پێوە لکاوە. ئەولیا چەلەبی باسی لەشکرکێشـیەکانی سـاڵەکانی 1640 و 1655 دەگێڕێتـەوە و ئێزیدیەکان بە خـەڵکی ( هەشت سمێل) ناو دەبات. ئێزیدییـەکان لە سەدەی هەژدەهەم 250000 کەس بوون، 4000 سوارچاك و 8000 سوارەیان هەبووە. لە سەدەی نۆزدەهەم بوونەتە 200000 و 3000 سوارچاك و 6000 پیادە . ئۆپێراسیۆنی ڕەشـەکوژی ئێزیدییـەکان هێندە ترسناك بووە بە جۆرێك کە لە نیوەی سەدەی نۆزدەهەمدا تەنها

---

[11] Xavier de Planhol, *Minorités en Islam : Géographie politique et sociale*, Ed. Flammarion, Paris, 1997, p. 180

[12] ڤ، ف، مینورسـکی، الاکراد: ملاحظات و انطباعـات، ترجمة د. معـروف خزنـدار، دار الکاتب، بیروت، 1987، ص 78

50000 کەسیان لێماوەتەوە[13]. هێرشەکانی والی بەغدا، سلێمان پاشا 1791 هێندە دڵرەقانە بووە تەنانەت یەك ئێزیدی لەودیو چیای شەنگالْ نەمێنێت[14]. ساڵی 1802 عەلی پاشا، والی بەغدا هێرشی کردە سەرە شەنگالْ و ژمارەیەکی لە رادەبەدەری لێ کوشتن. سلێمان پاشا ساڵی 1809 بە هەمان شێوە. ساڵی 1837 رەشید پاشا لەگەڵ کۆمەڵێك کورد هێرشی کردە سەر ئێزیدییەکان و هێندەی لێ سەربڕین کە خوێن لە سەر ڕێگە و بانی ئاواییەکان دەڕژا و بەمجۆرە تا ساڵی 1845 تەنها 50000 کەس یان لێمایەوە[15]. بەداخەوە میر و بەگە کوردەکانیش بە هەما شێوەی عوسمانیەکان دەستیان بە خوێنی ئێزیدیەکان سووربووە و بەشداری لەشکرکێشیەکانیان کردووە بۆ ئێزیدی کوژی، عەبدولرەحمان پاشای بابان و هەروەها میری بەتاویانگی جەزیرە و بۆتان، میر بەدرخان ( 1809 –1870 ) لە ساڵی 1832 دەستی لە ئێزیدیەکان وەشاندبوو و یەکێك لەو هۆیانەش کە وای کرد بەدرخان بەگ لە کاتی لەشکرکێشی ساڵی 1847 ی سوپای عوسمانی ئەو گەرەنتیە ڕەتبکاتەوە کە بۆ بەدرخان پاشایان دابوو، ئەوەبوو کە دەترسا دواتر لە ژێر فشاری ئەوروپیەکان لە سۆنگەی کارەکانی دژ بە نەستووریەکان و ئێزیدییەکان پەلکێشی بەردەم دادگا بکری[16]. بەلام گورجی لە

---

[13] الاب انستاس الكرملي، ، اليزيدية، المشرق، المجلد الثاني، 1899بيروت، ، ص. 834

[14] الاب انستاس الكرملي، ، اليزيدية، المشرق، المجلد الثاني، 1899بيروت، ، ص. 834

[15] الاب انستاس الكرملي، ، اليزيدية، المشرق، المجلد الثاني، 1899بيروت، ، ص. 834

[16] Hasan Gökçe, *Portrait d'un Emir kurde, Beder Khan Bey*, In Société et cultures musulmans d'hier et d'aujourd'hui, Paris, 1996, p. 79.

هـەموان گـورجکتر بـڕ، مـیری ئـەمارەتی سـۆران، پاشـای کـۆرە لـە ئێزیدیەکانی وەشاند. بەمشێوەیە لەسەدەی هەژدەهەم و دواتریش لە سـەدەی نۆزدەهـەم کوشـتنی ئێزیـدییێك لـە ئێمپراتۆریـای عوسمـانی هـەقی بـە بەهەشـت شـادبوونی بـە موسـلمانان دەبەخشـی چونکو لـە دیدی دەوڵەتدا " ئێزیدی ئایـێنێکی بێ کتێب بوو" و لەو دیو یاسای ئیسلامەوە بوون.

سـالی 1847 بـە دەستپێشـخەری دیپلۆمـاتی بریتـانی لـە کۆنسـتانتینۆپل، بابیعالی ئیعتراف بـە ئـایینی ئێزیـدی دەکات و لـە خزمـەتی سـەربازیان ڕەها دەکات[17]. ئۆکتۆبـەری سـالی 1849، شێخ یوسف وەك نوماینەدەی ئێزیدییەکان بۆ پاڕانەوە لـە ئازادبوونیان لە خزمەتی سەربازی دەچێتە لای بەرپرسانی ئیمپراتۆریای عوسمانی، سەردانی کۆنستاتینۆپل دەکات و نامەیەك دەداتە سـەدری ئـەعزەمی عوسمـانی[18]. دەوڵـەتی عوسمـانی داواکـەیان قـەبوول دەکات بـەلام لـە سـالی 1872 دووبـارە ئـەم لـە خزمـەتی سـوپا بەخشـینەیان

[17] Parry, Oswald,-B.A., *Six months in a Syrian monastery, being the record of a visit to the head quarters of the Syrian church in Mesopotamia, with some account of the Yazidis or devil worshippers of Mosul and El Jilwah, their sacred book*, London, Horace. Cox : 1895 p. 358

[18] Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*, Ed. KPI, London & New York, 1987, p. 208

لێهەڵدەوەشێننەوە[19] لەگەڵ داواکردنەوەی ئێزیدییەکان بۆ خزمەتی سەربازی، ساڵی 1872 کۆمەڵێك لە پیاو ماقوڵانی ئۆڵی ئێزیدی داواتنامەیەك ئاراستەی دەسەڵاتکارانی بابیعالی دەکەن و لەو نامەیەیاندا لە چواردە خاڵ پرەنسیپەکانی ئایینی خۆیان روونکردۆتەوە کەوا سیستمی ئایینیان رێگرە لەوەی بتوانن خزمەتی سەربازی بکەن[20]. وا دیارە هەموو هەوڵەکانی دیپلۆماتە ئینگلیزەکان نەیانتوانی پرۆسەی لەشکرکێشی بۆ سەر ئێزیدیەکان بوەستێنن. لە نیوەی دووەمی ساڵی 1892 کۆلۆنێل عومەر پاشا لەسەر داوای سولتانی عوسمانی و بە بیانووی چەند ریفۆرمێك لە ناوچەی موسل هێرشی کردە سەر ئێزیدییەکان و دوای کوشت و کوشتارێکی زۆر 15000 ئێزیدی لێ بە دیل گرتن. عومەر پاشا سەرەتا کورەکەی خۆی ناردە شەنگاڵ تا داوایان لێبکات موسلمان بن و واز لە ئایینی خۆیان بهێنن. بە گوێرەی رۆجەر لیسکۆ ئێزیدییەکان لە نێوان ساڵەکانی 1640 تا 1910 بیست کوشتاری گەورەی کۆمەڵکوژیان لێکراوە[21]. دوایەمین هێرشی سوپای عوسمانی لە دوا دواییەکەی ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بوو هەرتەنیا دوو

---

[19] بڕوانە: Lescot, R., *Enquête sur les Yezidis de Syrie et du Djebel Sindjar*. : [Institut français Mémoires de l'Institut français de Damas de Damas], 1938, p. 126.

[20] دەقی تەواوی ئەم سکاڵانامەیە بە کوردی لە پاشکۆی ئەم کتێبە بڵاوکراوەتەوە، وەرگێر.

[21] Izady, mehrdad, *The Kurds: A Concise handbook*, Ed. Taylor & Francis, 1992, p. 157

مانگێك بەر لە خۆبەدەستەوەدانی بابیعالی و ڕاگەیاندنی ئاگربەسی مۆدرۆس بوو.

## ئێزیدی و ئەهلی هەق: پرسی دروستبوونی گەردوون

تا ئێستە لە لێکۆڵینەوکاندا دیاردی بۆ پێوەندی نێوان ئایینی ئێزیدی و فیرقەی ئەهلی هەق نەکراوە، ئەو باسەی کە دەکرێ چەندین لێکۆڵینەوی دوورو درێژی بۆ تەرخانبکرێ بکرێ. ڕەنگە یەك لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئایینی ئێزیدی و ئەهلی هەق ئەوە بێت کە هەردووکیان ئەگەر پاشماوەی ڕاستەوخۆی ئایینی زەردەشتیش نەبن ئەوا کۆمەڵێك تووخم و بنەمای زۆری زەردەشتایەتیان پاراستبێ کە جۆرە نزیکایەتیەك لە نێوان هەردووکیان دیاری دەکات. من لێرە تەنها ئەو دەرفەتەم هەیە کە چەند سەرەتەڵەمێکی درشت بخەمە سەرکاغەز و لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلی ئەم بابەتە بۆ خەڵکانی شارەزاتر لەمبوارە جێدەهێڵم.

پێم وایە نزیکی گەورەی ئێزدیاتی و ئەهلی هەق لە بارەی مەسەلەی دروستبوونی گەردوون و برێك لە باوەڕە ئایینەکانیان سەرچاوە دەگرێ. بە گوێرەی مەسحەفا رەش ( 28- پێش ئەوەی ئاسمان و زەوی دروستببێ، خوا لەسەر زەریایەکاندا هەبوو. پاپۆڕێکی دروستکردبوو کە بە هەوەسی خۆی پیاسەی بۆ هەموو لایەك دەکرد)[22] . بە هەمان شێوە لای ئەهلی هەق زەریا توخمێکی سەرەکییە و بەر لە دروستکردنی گەردوون زەریا بە تەنها لەگەڵ خوا

---

[22] بڕوانە تێکستی مەسحەفا ڕەش لەم کتێبەدا، لا: 95.

هەبووە[23]. بە هەمان شێوە لای ئەهلی هەق خوا حەوت فریشتەی لە یەکەم رۆژدا دروستکردن و میکایل سەرۆکی فریشتەکانە. هەمان شت لای ئایینی ئێزدی بە جیاوازی ئەوەی خوا لە هەفتەیەکدا هەر رۆژە و فریشتەیەکی دروستکردووە و لێرەدا مەلیك تاوس وەکو میکایل لای ئەهلی هەق سەرۆکی فریشتەکانە. لە میتۆلۆژیای دروستبوونی گەردوون لای ئەهلی هەق خوا داوای لە جوبرایل کردووە تا خۆڵی بۆ بهێنێ و مرۆڤی لێ دروستبکات، بەڵام جوبرایل رازی نەبووە و دواتر عیزرایل ئەم ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ[24]، بە هەمان شێوە لە مەسحەفا رەش خوا فرمان بە جوبرایل دەکات کەمێك خۆڵی بۆ بهێنێ، بەڵام لە مەسحەفا رەش جوبرایل گوێرایەلی دەکات، (با)، ئاگر و ئاو تێکەڵ بە خۆڵەکە دەکات و بەمشێوەیە هەوەڵین مرۆ دروستدەکات. لە تیۆریای دروستبوونی گەردوون لای ئەهلی هەق حەوت زەوی و حەوت  ئاسمان هەیە[25]، بە هەمان شێوە لە مەسحەفا رەش خوا حەوت ئاسمان، زەوی، خۆر و مانگی دروستکردوون. بە گوێرەی تەزکەری ئەعلا لای ئەهلی هەق خوا مرواریەك دروستدەکات و لە ناو مرواریەکە پێنج شێوەی خۆی تێدا وەدیاردەخات[26]

[23] Mohammad Mokri, *Recherches de Kurdologie: Contribution scientifique aux études iraniennes*, Paris, Ed. Librarie Klincksiech, 1970, P. 217.

[24] Mohammad Mokri, *Recherches de Kurdologie...op.cit*, P. 218.

[25] Mohammad Mokri, *Recherches de Kurdologie...op.cit*, P. 220.

[26] Mohammad Mokri, *Recherches de Kurdologie...op.cit*, P. 214.

بەهەمان شێوە لە مەسحەفا رەش خوا هەوەڵجار مرواریەکی گەورەی سپی لە زاتی خۆی دروستدەکات[27]. جگە لەوە بیرۆکەی پۆشاکپۆشی (تەجەللی) لە ناو هەردوو ئاییندا هەیە و لای ئەهلی هەق زیاتر بە واتەی پاداشتدانەوە یا پەشیمانبوونەوەی ژیانی پێشووتر دەگەیەنێ. کەچی لە جیلوەدا پۆشاکپۆشی پاداشتدانەوەیە بۆ دووبارە تێهەڵچوونەوە بۆ ناو ژیان. من پێم وایە پێوەندیکی نزیك لە نێوان ئەهلی هەق و ئێزیدیایەتی هەیە. ئیڤانۆڤ لە شیراز دەستنووسێکی ئەهلی هەقەکانی دۆزیوەتەوە کە ئیشارە بە مەلیك تاوس دەکات[28]، جگە لەوە مرۆڤ دەتوانێ زۆر توخمی هاوبەش لە نێوان هەردووکیان ببینێتەوە، بۆ نموونە رۆژوو گرتن، چ ئێزیدیەکان و چ ئەهلی هەقەکان هەر تەنها سێ رۆژ بە رۆژوو دەبن. من لێرە هەر بەوەندە دەستبەردار دەبم و زۆر بەهیوام چەند پسپۆرێك خۆیان بۆ بەراوردکارییەکی ئاوەها تەرخانبکەن کە بەراستی کتێبخانەی کوردی پێویستیەتی.

## ئێزیدیناسی

---

[27] دەکرێ مرۆڤ لێرە دوور لە تەنها روانینە وەرگێراوە عەرەبییەکەی مەسحەفا رەش بەو ئەنجامە بگات کە چ جیلوە و چ مەسحەفا رەش لە نێوان سەدەی یانزە و سێزدەهەمدا نووسراوبن.

[28] بڕوانە چەند *باسێك دەربارەی ئەهلی هەق*، وەرگێرانی لە فرانسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، 2004، لا: 72.

بە گوێرەی زانیاری و سەرچاوەکانی ئێمە، یەکەم کەسێك لە ئەوروپاییەکان زانیاری یان لەبارەی ئێزیدیەکانەوە بە دەستەوە دابێت Michel Febvre بووە لە کتێبی *Teatro della Turchia*[29] کە ساڵی 1681 لە میلانۆ بە زمانی ئیتالیایی چاپکراوە و لە لاپەرەکانی 269 تا 252 زانیاری و راگەیاندن لە بارەی ئێزیدیەکان بە دەستەوە دەدات و وەك " شەیتان پەرست" باسیان دەکات. شایانی گوتنە نووسیار لەم کتێبەی خۆیدا نکوڵی لەوە دەکات ئێزیدیەکان هیچ کتێبێکی ئایینیان هەبێت. دوای ئەوە دۆمینیکە ئیتالیەکانی مسیۆنی موسل بایەخ بە ئێزیدییەکان دەدەن و P. Lanza ساڵی 1769تێبینی ئەوە دەکات کە ئێزیدییەکان شەیتان یان لە لا پیرۆزە و باوەڕیان وایە ئەوەی مانیەکانن. دواتر گارزۆنی 1781 پێوەندی لەگەڵ یەزیدی یەکەم هەبووە[30] و ساڵی 1807 بە ئیتالی وتارێکی لە بارەی ئێزیدییەکان نووسیووە[31].

---

[29] شایانی گوتنە ئەم کتێبە ساڵێك دوای بڵاوبوونەوەی چاپە ئیتالییەکەی لە لایەن خودی نووسەرەکەیەوە کرایە فرانسی و لە پاریس بڵاوکرایەوە. بڕوانە: Cf. *Théâtre de la Turquie*, Traduit d'italien en français ; par son auteur le Sir Michel Febvre, Paris, 1682.

[30] Bois, Thomas, *Les yézidis : essai historique et sociologique sur leur origine religieuse*, In Al-Machriq, n° 55, 1961, p. 112.

[31] بۆ دەقی گوتارەکە بە ئیتالیایی بڕوانە، Garzoni, Maurizio, O.P., *Della Setta delli Jazidij*. In Abat Domenico Sestini, Viaggi e opuscoli diversi, Berlin, 1807, pp. 203-12 بۆ وەرگێڕاوی فرانسی هەمان گوتار بڕوانە M*** (Rousseau), *Description du Pachalik de Bagdad, suivi d'une notice*

لەگەڵ دەستپێکی سەدەی نۆزدەهەم و لەگەڵ تەواو هەڵکشانی ئەوروپاییەکان بۆ ناو ڕۆژهەلات و بڵاوبوونەوەی مسیونێر و نێردە ئاینییەکان بە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، دەبینین لە هەموو گروپە ئیتنیە ئاینییەکانی دیکە زیاتر سرنجیان بۆ لای ئێزیدیەکان چووە. Campanille لە کتێبەکەی خۆیدا کە ساڵی 1812 لە ئیتالیا بە زمانی ئیتالیایی چاپکراوە بەشێکی کتێبەکەی[32] بۆ ناسین و بیرو باوەری ئێزیدییەکان تەرخانکردووە. لەوە بەدواوە بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ هیچ زانیاری و گوتارێکی دیکە کە شایەنی باسکردن بێت لە بارەی ئێزدیەکانەوە بەرچاوناکەوێت تاوەکو F Forbre, ساڵی 1838 گەشتێکی شەنگاڵ دەکات و گەشتەنامەکەی خۆی لە گۆواری کۆمەڵەی جوگرافیی شاهانە

historique sur les wahabis et de quelques autres pièces relatives à l'histoire et à littérature de l'Orient. Paris, 1809, (Notice sur les Yézidis), pp. 183-210

[32] بۆ مەتی کتێبەکە بە ئیتالیایی بڕوانە، Campanile, G, O.P., *Storila della regione del Kurdistan e delle sette di religions ivi estistenti,* Napoli, 1818, cap. IV. Habitanti del Kurdistan, p. 146-165 بۆ وەرگێڕاوی فرانسی هەمان کتێب بڕوانە Campanile, G, O.P., *Les habitants du Kurdistan : Les Yézidis*. In Histoire du Kurdistan, traduit de l'italien par le P.P. Thomas Bois, O.P, Ed. L'Harmattan, Paris, pp. 95-106.

بلاودەکاتەوە[33] و لەویّ بیستوویە کە ئێزیدیەکان کتێبێکی ئایینیان هەیە بە ناوی مەسحەفا رەش کە هی شێخ ئادی خۆیەتی. رەنگە یەکەمین هەوڵی راستەقینەی ناسینی ئێزیدیەکان لە لایەن ئارکیۆلۆگ و دیپلۆماتی بریتانی هێنری لایارد بووبێت کە ساڵی 1849 لە کتێبەکەی خۆیدا گەلێك زانیاری بە کەڵکی لەبارەی جەژنە ئایینیەکانی ئێزیدیەکان تۆمارکردووە[34]. دوای لایارد ، ساڵی 1852 لە لەندەن مسیۆنێری ئەنگلیکان Badger لە کتێبەکەی خۆیدا زۆر چەمکی ناڕاست و نا دروستی لە بارەی ئێزیدیەکان بلاوکردەوە کە دواتر بوون بە سۆنگەی زۆر بیرو ڕای چەوت و نا دروست لەبارەی ئێزیدیەکانەوە[35]. دوای Badger لە ساڵی1861 ئانیسۆرس

[33] Forbes, F., A *Visite to the Sinjar Hills in 1838, with some account of the Sect of the Yezidis and of various places in the Mesopotamia Desert, between the River Tigris and Khabur*, In Journal of the Royal Geographical Society 9, 1839, pp. 409-430.

[34] Layard, A.H., The Yezidis. In *Nineveh and its Remains with an Account of a Visit to the Chaldaean Christians of Kurdistan, and the Yezidis, or Devil-Worshippers; and an Enquiry into the Manners and Arts of the Ancient Assyrians, Vol I, 1849, London: John Murray, pp. 225-266.*

[35] Badger, G. P., Yezeedees. In *The Nestorians and their Rituals with the Narrative of a Mission to Mesopotamia and Coordistan in 1842-1844 and of a Late Visit to these Countries in 1850; also, Researches*

باسێکی لەبارەی بنچینەی ئاسووری بوونی ئێزیدیەکان نووسی و دەیانباتەوە سەر ئاسووریەکان. بەمشێوەیە تا ساڵی 1880 هیچ هەوڵێکی دیکە نەبووە بۆ ناسینی ئێزیدییەکان، لە نێوان ساڵەکانی 1880-1885 سیوفی، جێگری کونسلی فرانسا لە موسل لە سێ وتاری نایابدا کە زۆربەی زانیاریەکانی لە ناوچەکە کۆکردبۆوە لە گۆواری ئاسیەویدا *Journal Asiatique* بڵاویکردنەوە[36] کۆمەڵێك زانیاری نوێ لە بارەی ئێزیدییەکان بە دەستەوە دەدات. ئەوروپاییەکان دەیانزانی ئێزیدیەکان کتێبی ئایینی تایبەت بە

---

*into the Present Condition of the Syrian Jacobites, Papal Syrians, and Chaldeans, and an Inquiry into the Religious Tenets of the Yezedees*, I. London: Joseph Masters, 1852, pp. 105-134.

[36] بۆ هەر سێ وتارەکە بڕوانە:

1- Siouffi, N., *Une courte conversation avec le chef de la secte des Yézidis ou les Adorateurs du Diable»*, In Journal Asiatique, 7: 18: 1880, pp. 78-83.

2-Siouffi, N., *Notice sur la secte des Yezidis*, In Journal Asiatique, VII Série, vol. 19, 1882 pp. 252-68.

3- Siouffi, N., *Notice sur le Cheikh 'Adi et la Secte des Yezidis*, Journal Asiatique, VIII Série, vol. 5,1885, pp. 78-100.

خۆیان هەیە[37] لەم ڕوانگەیەوە گەلێك هەوڵیاندا دەستیان بە کتێبی ئایینیان ڕابگات بەڵام سەرنەکەوتن. تەنانەت لایارد کاتێك لەناو ئێزیدییەکان بووە دزیشی تەرخانکردووە کتێبەکانی بۆ بدزێ، بەڵام هەموو ئەمان هیچیان لێوە شین نەبوو. ساڵی 1884، کونسلی ڕووسا یو.س. کارتسۆف باسێکی لەبارەی ئێزیدییەکان بە زمانی ڕووسی نووسی و لەوێدا نووسیوویە کە ئەو چاوی بە بڕێك لە کتێبی جیلوە کەوتووە و دواتر بە یاریدەی جێرمیا شامیر Jeremiah Shamir بەشێکی لەو کتێبە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی و دواتر شەرحێکی نزیکەیی ناوەڕۆکی کتێبی مەسحەفا ڕەشی کردووە[38].

ئاداری 1891، مسیۆنێری ئامریکایی ئەلفێنز.ن، ئاندروز لە

---

[37] لایارد و بادجەر هەردووکیان کتێبی ئێزیدیەکانیان بینیبوو بەڵام نەیانتوانیبوو بندەستیانبخەن، بڕوانە.

Menant, Joachim (1820-1899), *Les Yézidiz : épisodes de l'histoire des adorateurs du diable*, Paris : E. Leroux, 1892 p. 105.

[38] ڤ. ف، مینۆرسکي، الاكراد: ملاحظات و انطباعات، ترجمة د. معروف خزندار، دار الكاتب، بیروت، 1987، ص 76. کارتسۆڤ دەنووسێ گوایە ساڵی 1884 جارێکیان هاوەڵی پیرس بادجەری کردووە بۆ لای ئێزیدیەکان و توانیویانە ئەو هێندە شەراب بدەنە شێخ ناسر تا ڕادەی سەرخۆشبوون و ڕازیان کردووە کتێبی جیلوەیان پێ نیشان بدات. وەختایەك شێخ خەوی لێکەوتووە توانیویانە چەند لاپەرەییکی لەبەر هەڵبگرنەوە، بەڵام بادجەر ئەم سەربووردەیە دووپات ناکاتەوە، بڕوانە Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*, Ed. KPI, London & New York, 1987, p.145

ئینسیکلۆپیدیای مسیۆنی ئامریکیدا وتارێکی له بارەی ئێزیدییەکان بڵاوکردەوە و بۆ یەکەمجار تەرجەمەیەکی وشە بە وشەی چەند دەقێکی کتێبی جیلوە و مەسحەفا رەشی بە ئینگلیزی بڵاوکردەوە بێ ئەوەی سەرچاوەی کتێبەکان دەستنیشانبکات[39]. ئۆ.ھ.پاری ساڵی 1892 وەختایەك موسڵ بەجێدەهێڵێ تا بگەڕێتەوە ماردین، کتێبێکی دەستنووسی چکۆڵە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ کە سکاڵانامەکەی ساڵی 1872 و هەردوو تێکستی عەرەبی کتێبی جیلوە و مەسحەفا رەشی تێدا بووە کە دواتر ساڵی 1895بۆ یەکەمجار E. G. Browne لە ڕووی دەستنووسی ناوبراو هەردوو تێکستی کتێبی جیلوە و مەسحەفا ڕەشی لە پاشکۆی کتێبەکەی مسیۆنێری ئینگلیزی .O.H Parry بە وەرگێڕانی ئینگلیزی و لێکدانەوە بڵاوکردەوە[40]. شایانی باسە ئەم دەستنووسە ڤێڤرییەی ساڵی 1894 بە 30 فرەنك دەفرۆشرێتە کتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس و ئێستە ئەم دەستنووسە بە کۆدی BNF. MS.324 لە هەمان کتێبخانەی ناوبراو پارێزراوە. دوو ساڵ دواتر (1896) ژان پاتێست شابۆ لە ڕووی دەستنوسێکی ئاسوورییەوە کە کتێبخانەی نیشتمانی پاریس لە موسڵ وەچنگی خستبوو و ئێستەش لەم کتێبخانەیە پارێزراوە کورتە باسێکی مێژووی کۆنی ئێزیدییەکان

[39] Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*.....op.cit, p. 143.

[40] Browne, E, G., *The Yazidis of Mosul.* Appendix to Parry, O. H. -b., *Six months in a Syrian monastery*, London, H. Cox : 1895, pp. 357-387.

دەگێڕێتـەوە و باسـی شـێخ ئـادی و دۆگمـە ئاینییـەکانی ئێزیـدیاتی دەکات[41]

سـاڵی 1909 دکتۆر عیسا جۆزێف Isya Joseph لە گۆواری *The American Journal of Semitic Languages and Literatures* بەرگی 25 دا لە وتارێکی دوورو درێژدا بۆ یەکەمجار تێکستی هەردوو کتێبی ئایینی ئێزیدییەکان بە عەرەبی لەگەڵ چەند پاشـکۆیێك کە بریتیبوون لـە حەکایـەتێك لـەبارەی کۆچك و ستایشـی شێخ ئادی و برێك بابەتی دیکە کە لە موسل لـە دەستنووسێك سـاڵی 1898لـە لایـەن داود الصـایغ-وە بەردەستیخسـتبوو بـە شـەرح و وەرگێڕانی ئینگلیزییەوە بڵاویکردەوە[42]

---

[41] Chabot, Jean-Baptiste (1860-1948), *Notice sur les Yezidis, publiée d'après deux manuscrits syriaques de la Bibliothèque nationale et traduite par M. J.-B. Chabot*, Paris, Impr. Nationale. In JA, Série 9, Tom 7, 1896, pp. 100-132.

[42] نووسیاری ئەم وتارە عیسی جۆزیف موکسی کاهینی ئاسووری، ساڵی 1898 بە ماڵ و منداڵەوە پەڕیوەی ئەمریکا دەبێ بەر لەسەفەرەکەی داود الصایغ لە موسڵ دەستنووسێکی عەرەبی پێشکەش دەکات کە وەرگێڕاوی عەرەبی هەردوو کتێبی پیرۆزی ئێزیدیەکان و چەند لاواندنەوەیك بۆ شێخ ئادی تێدابووە هتد. جۆزیف ساڵی 1907 لە زانکۆ کۆلۆمبیا بروانامەی ماستەری فەلسەفە لەسەر بابەتی ( ئێزیدیەکان- شەیتان پەرستان: کتێبی پیرۆزیان و داب و نەریتیان) پێشکەش بە زانکۆی کۆلۆمبیا دەکات. ئەم وتارە هەر هەمان ماستەرنامەکەیەتی وێرای بڵاوکردنەوەی دەقە عەرەبیەکان. هەر هەمان وتار دە ساڵ دواتر بە وەلاتانی بەشە عەرەبییەکە و لێکدانەوەی ئایینی ئێزیدی وەکو کتێبێکی سەربەخۆ بڵاوکرایەوە، بڕوانە: Joseph, Isya, *Devil-Worship: the sacred books and traditions of the Yezidis. Studies on the origin and traditions of the devil-worshippers*. 1919, Boston: Badger.

جێگری کونسلی فرانسا لە موسل، لیۆن کراژوسکی Léon Krajewski لە نێوان ساڵەکانی 1903 تا 1906 بایەخی بە ئێزیدیەکان دەدا و زیارەتێکی لالشی کرد و ئەویش گوێ بیستی ئەوە بوو بوو کە ئێزیدیەکان کتێبخانەیەکیان لەسەر چیای شەنگاڵ هەیە. وێڕای پێوەندی بەتینی لەگەڵ یەکێك لە سەرۆکە ئێزیدییەکان کەچی هیچی بەردەست نەکەوت[43]

ساڵی 1911 بۆ یەکەمجار لە سایەی ئەنستانس ماری کەرمەلی بۆ یەکەمجار وەرگێڕانی فرانسی هەردوو کتێبی جیلوە و مەسحەفا ڕەش لە گەڵ تێکستی ئەسلی هەردوو کتێبەکە بە ئەلفبێ ی تایبەتی کوردی ئێزیدییان بڵاوکردەوە و کۆمەڵێك زانیاری تازەشی خستنە ڕوو. بەگوێرەی زانیاریەکانی ئەنستانس ماری کەرمەلی کە لە ڕێگەی حەبیب ناوێکی خوازراو و کۆنە کتێبخانەوانی ئێزیدییەکان کە لە ئایینی ئێزیدی هەڵگەڕابۆوە و بووبووە مەسیحی، گوایە کتێبەکان ئەو هێندە بە نهێنی هەڵگیراون کە ئەستەمە بزانرێ لە کوێن. کتێبەکان لەگەڵ کۆمەڵێك کتێبی دیکە بە زمانی جیاجیا لە ناو سندوقێکی شاراوە لە ناو ئەشکەوتێکی چیای شەنگال دا شاردراونەتەوە[44] و تەنها سێ کەس کلیلی سندوقی ئەو کتێبانەیان لابووە کە ئەوانیش:

---

[43] Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*…….op.cit, p. 153.

[44] کەس نازانێ داخۆ ئەو سندوقە پیرۆزەی کە کتێبە ئایینەکانی ئێزیدیەکان و کۆمەڵێك کتێبی دیکەی بە زمانە جیاجیایەکان تێدابووە و بە قسەی کەرمەلی ( لە زاری حەبیب دەیگێڕێتەوە) گوایە مێژووی ئەم کتێبانە دەگەڕێنەوە بۆ دەورانی یەکەمی مەسیحایەتی لە کوردستان چیان بەسەر هاتووە؟ ئایا بوونەتە خۆراکی مشك و ماریان تا ئێستە هەر شاراوەن و کەس بۆی نییە توخنیان بکەوێ؟ یاخود ئەم کتێبخانەیە هەر لە بنەڕەتدا بوونی نەبووە و بە هەر نیازێکەوە بێت دەمکوژێکی هەڵبەستراو بوو؟

سەرۆکی ئاینی، سەرۆکی دونیایی و کتێبخانەرانن. کتێبخانەوان ئەرکی ئەوی پێسپێردراوە هەر شەش مانگ جارێك کتێبەکان بۆ ماوەیێك بخاتە بەر خۆر. بە قسەی ناوبراو ئەم کتێبانە زۆر کۆنن و هی دەورانی یەکەمی مەسیحیەکانن. دوایی ئەنستانس ماری خوا کاری ڕاست بکات توانیویە یەکێك لە کتێبخانەوانەکان کە ناوی حەمۆ بووە بە پارەیەکی زۆر ڕازی بکات تا کۆپیەکی کت و مت هەردوو کتێبەکە وەبندەستبخات و دواتر لە گۆواری ئانترۆپۆس *Anthrops* سالی 1911 لەگەلْ وەرگێڕانە فرانسییەکە هەردوو تێکستە کوردییە ئەسلیەکەی کتێبی جیلوە و مەسحەفا ڕەش – یشی بلاوکردۆتەوە و گەنجینەیەکی بەهاداری بۆ ئێمە پاراست کە ئەگەر بە هەر نیازێکەوە کرابێت شایانی هەموو ڕێزلێنان و پەسنێکە.

سالی 1916مینگنا Mingana لە وتاری (شەیتان پەرستان: بیرو باوەڕیان و کتێبی پیرۆزیان)[45] زۆر بە توندی رەخنە لە شەماس جێرمیا شامیر و ئەنستانس ماری کەرمەلی دەگرێ و گالتەی بەوە دێ کە ئەم فیرقە نەخوێندەوارە چۆن کتێبخانەوانیان هەبووە، میگنە بەو ئەنجامە دەگات کە نووسیاری عەرەبی کتێبە ئاینییەکانی ئێزیدیەکان شەماس جێرمیا شامیری لە دایکبووی عەنکاوەی نەدیابین و هەلاتووی دێرەی ئەلقوش بووە کە بەر لە دەسالْ ( واتە سالی 1906) دوای تەمەنێکی درێژ کۆچی دوایی کردووە و بە

[45] Mingana, A. "*Devil-Worshippers: their Beliefs and their Sacred Books*". The Journal of the Royal Asiatic Society of Great Britain and Ireland, 1916/XV, pp. 505-526.

قسەی میگنە، نوسیاری ئەم تێکستانە وێڕای ئەوەی بە عەرەبی نووسیوونی، بەڵام بە ئاسووری بیری کردوتەوە[46]. ساڵی 1927 ئا ، ئا، سیمیۆنۆڤ لە ڕووی وەرگێڕاوە ئینگلیزیەکەوە کردوونی بە رووسی، ساڵی 1930 Giuseppe Furlani هەردوو کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکان دەکاتە ئیتالیایی و لەگەڵ لێکۆڵینەوەیێکی تێر و تەسەل بەسەر یەکەوە لە بۆلۆنا بڵاویان دەکاتەوە[47]

بە عەرەبیش کەس نازانێ ئەم کتێبانە لە چ سەردەم و دەورانێکدا تەرجەمەی عەرەبی کراون، بە شیمانەی بەهێز لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە لایەن خودی ئێزیدییەکان خۆیان کراونەتە عەرەبی و دواتر عەباس عەززاوی، عبدالرزاق ئەلحەسەنی و صدیق الدملوجی زۆری دیکە کەم و زۆر هەمان تێکستیان بە عەرەبی بڵاوکردۆتەوە.

### مێژووی نووسینی کتیبی جیلوە و مەسحەفا رەش

تا ئێستەکە ساغ نەبۆتەوە داخۆ کێ کتێبی ئێزیدیەکانی نووسیووە؟ لە کام سەردەمدا نووسراون. ئایا دانەری هەردوو کتێب یەك کەسن یا دوو کەسی جیاواز؟

---

[46] بۆ زانیاری بە داوێنتر لەمبارەیەوە بڕوانە، Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*....op.cit, p.156.

[47] Furlani, Giuseppe., *Testi Religiosi dei Yezidi, Testi e Documenti per la Storia delle Religioni*, Bologna, 1930, pp. 71-91.

ئەم پرسانە تا ئێستە یەکلانەبونەتەوە و لە ناو لێکۆڵینەوەکاندا بیر و ڕای جیاواز جیاواز هەیە. کوردویڤ لای وایە هەردوو کتێبەکە نووسراوی شێخ ئادی -ین و لە سەدەی پانزەهەم یا دوانزەهەمدا نووسراون. مسیۆنێری ئامریکایی ئەنریوز[48] لە وتارەکەی خۆیدا لە ئینسیکلۆپیدیای مسیۆنی ئەمریکیدا چاپی ساڵی 1891 مێژووی نووسینی کتێبی جیلوەی بە 558 هـ- 1163 ی زاینی داناوە کە ئەو مێژووە لە مردنی شێخ ئادی نزیکە. هەرچی بۆ مەسحەفا رەشە ئەوا ساڵی 743 هـ - 1342-1343 ی داناوە کە تەواو سەد ساڵ دوای مردنی شێخ حەسەن دێت ( 644 ت-1246 زاینی )[49] . هەرچی ئۆ.ڤیلچڤسکی-یە لای وایە هەردوو کتێبە پیرۆزەکە لەسەدەی حەڤدەهەمدا نووسراون. نووسەرە خۆ ولآتیەکانی وەك عەباس ئەلعەززاوی، شاکیر فەتاح و ڕەشاد میران لایان وایە ئەم کتێبانە لەسەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون. بێ گومان ئەم بەرێزانەی کە دەڵێن ئەم کتێبانە لە سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون هەر تەنها لەسەر وەرگێراوە عەرەبییەکان ئەو حوکمەیان داوە بێ ئەوەی بەوە بزانن کە وەرگێراوە عەرەبییەکە دەشێ لەلایەن خەڵکانی ناشارەزا نووسرابێتەوە و هەروەك چۆن ڕێشی تێدەچێ لەسەدەی نۆزدەهەم بە مەبەستێك لە مەبەستەکان کرابنە عەرەبی. بەلآم ئەسلی مەبەست بەهیچ شێوەیێك وەرگێراوە عەرەبیەکان نییە بەڵکو کتێبە

[48] Andrus, Rev. A.N., *The yezidees*. In Encyclopaedia of Missions, New Yourk, 1891, vol 2, pp. 526-8.

[49] Gues:, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*.......op.cit, p. 240.

ئۆریژینالەکانە بە زمانی کوردی خۆی. عەباس ئەلعەززاوی حوکم لەسەر وەرگێراوە عەرەبییەکە دەدات و لای وایە بە گوتەی زمانی عامیەی عێراقی ئەمڕۆ نووسراون و پێکهاتەی رستەکان ناشازە و بە ڕای ئەو شێمانەی ئەوە هەیە لە بەغدا نووسرابنەوە[50]. لە هەمان روانگەوە رەشاد میران لای وایە چونکە وشەی مسقۆف کە واتەی مۆسکۆ دەگەیەنێ لە کتێبی مەسحەفا رەش- دا هاتووە و ئێزیدیش تەنها لەسەدەی نۆزدەهەم لە قەفقاز دەژین بۆیە هەردەبێ بە رای نووسەر ئەم کتێبانە لە سەدەی نۆزدەهەمدا نووسرابن[51]. بەر لە هەرچی دەمەوێ هەڵەیەکی مێژوویی بۆ میران راستبکەمەوە کە بڕێك تیرە و هۆزی ئێزیدی بەر لەسەدەی نۆزدەهەم، لە سەدەی هەژدەهەمەوە لە ئەرمەنستان ژیاون، بەڵام لە دوای جەنگی قرم 1856-1863 و دواتر دوای جەنگی ڕووسی-تورکی 1877-1878 بە شێوەیەکی لێشاو گەیشتنە ڕووسیا. من پێم وایە هەردوو کتێبی ئێزیدیەکان زۆر بەر لە سەدەی نۆزدەهەم نووسراون؛ بەر لە هەچی فەتواکەی شێخ عەبدوڵلای رەبتەکی لە ساڵی 1724 واتە لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەم بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی مێژووییە و خەتێکی راست و چەپ بەسەر ئەو بۆچوونانە دەهێنێ کە لایان وایە کتێبی ئێزیدییەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراون. شێخ عەبدوڵلای رەبتەکی سەرەتای سەدەی هەژدەهەم زانیویەتی کە

---

[50] عباس العزاوي، *تاريخ اليزيدية و اصل عقيدتهم*، بغداد،1935 ، ص: 187-188.

[51] بۆ شارەزابوون لە بیرو رایەکانی رەشاد میران لەمبارەیەوە بڕوانە: رەشاد میران ( دکتۆر)، *رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا*، کتێبی سەنتەری برایەتی 7، چاپی دووەم، کوردستان، 2000 لا: 104 تا 107

ئێزیدیەکان کتێبی جیلوەیان هەیە و بە قسەی ئەو لە لایەن شێخ فخرالدین نووسراوە، ئەمە هیچ گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە دەبێ زۆر بەر لەو مێژووە ئەم کتێبە بوونی هەبووبێ[52]. لە کۆمەڵگەیەکی ئاوەها داخراو و نهێنی پارێزی ئایینی ئەگەر ئەم کتێبە گەلێك پێشتر نەنووسرا بێت و نەبووبێ، ناشێ هەروا بە ئاسانی لەسەرتای سەدەی هەژدەهەم هەواڵی بزانرێ. ئێمە کە باس لە کتێبەکانی ئێزیدییەکان دەکەین نابێ لەسەر وەرگێراوە عەرەبییەکان بڕیار بدەین و بکەوینە ناو هەڵەی وەرگێراوە عەرەبییەکان مادام کتێبەکە خۆی لە بناغەدا بە کوردی نووسراوە و تەواوی نوێژ و وێرد و هەموو پەرستنێکی ئەم ئایینە هەر بە کوردییە و تەنانەت لای ئێزیدییەکان خوا خۆیشی بە کوردی قسەدەکات[53]. من ناتوانم ئەوە یەکلا بکەمەوە داخۆ کەی کتێبە ئاینییەکان نووسراون، بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم کە مێژووی نووسینی ئەم کتێبە کوردیانە زۆر کۆنە و پێم وانییە لەسەدەی هەژدە و نۆزدەهەمدا نووسرابن و شیمانەی بەهێز ئەوەیە دەشێ لە سەدەکانی یانزە یا دوانزە نووسرا بن و ڕەنگە کۆنتریش بن. ئێمە جارێ دەرگەی ئەم باسە بە کراوەیی بەجێدەهێڵین تا ئەو کاتەی بەڵگەنامەی گردەبڕمان وەچنگ دەکەوێ.

---

[52] دەستنووسی دەقی فەتواکەی شێخ عەبدوڵلای ڕەبتەکی بە قسەی عەبباس عەززاوی لە کتێبخانەی سلێمانی بە کۆدی ژمارە 116 پارێزراوە، بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ اليزيدية و اصل عقيدتهم، بغداد، 1935 ، ص. 85. هەروەها عەززاوی دەقی تەواوی فەتواکەی لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیوەتەوە بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا: 84-89.

[53] Messoud Fany, *La nation Kurde et son évolution sociale*, thèse de doctorat, Ed. Librairie L. Rodstein, Paris, 1933, p. 95

## سەرچاوەکان


1-Planhol, Xavier de, *Minorités en Islam: Géographie politique et sociale*, Ed. Flammarion, Paris, 1997.

2- Chevalier, Michel, *Les montagnards Chrétiens du Hakkari et du Kurdistan septentrional*, Ed. Publication du l'Université de Paris Sorbonne, Paris, 1985

3-Izady, mehrdad, *The Kurds: A Concise handbook*, Ed. Taylor & Francis, 1992

4- Hasan Gŏkçe, Portrait d'un Emir kurde, Beder Khan Bey, In Société et cultures musulmans d'hier et d'aujourd'hui, Paris, 1996

5-Parry, Oswald,-B.A., *Six months in a Syrian monastery, being the record of a visit to the head quarters of the Syrian church in Mesopotamia, with some account of the Yazidis or devil worshippers of Mosul and El Jilwah, their sacred book*, London, Horace. Cox : 1895

6-Mohammad Mokri, *Recherches de Kurdologie: Contribution scientifique aux études iraniennes*, Paris, Ed. Librarie Klincksiech, 1970

7-Bois, Thomas, Les yézidis : essai historique et sociologique sur leur origine religieuse, In Al-Machriq, n° 55, 1961

Menant, Joachim (1820-1899), *Les Yézidiz : épisodes de l'histoire des adorateurs du diable,* Paris : E. Leroux, 1892

8-Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*, Ed. KPI, London & New York, 1987

9-Messoud Fany, *La nation Kurde et son évolution sociale,* thèse de doctorat, Ed. Librairie L. Rodstein, Paris, 1933

10- ڤ ف، مينورسكي، الاكراد: ملاحظات و انطباعات، ترجمة د. معروف خزندار، دار الكاتب، بيروت، 1987

11- الاب انستاس الكرملي، اليزيدية، المشرق، المجلد الثاني، بيروت ،1899

12- رەشاد میران ( دکتۆر)، *رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا*، کتێبی سەنتەری برایەتی 7، چاپی دووەم، کوردستان، 2000

13- عباس العزاوي، تاريخ اليزيدية و اصل عقيدتهم، بغداد، 1935

14-ا.م.مینتیشاشڤیلی، کورد: کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتیی- ئابووریی، رۆشنبیری و گوزەران، وەرگێرانی لە رووسییەوە: د.عیززەدین مستەفا رەسوول، سلێمانی

15- الامير شرف خان البدليسي، *شرفنامة*، ترجمة محمد جميل الملا احمد الروذبياني، الطبعة الثانية، كردستان، 2001

# یەکەم بەش

ئەنستاس ماری کەرمەلی

## دۆزینەوەیێکی تازەی
## دوو کتێبی پیرۆزی ئێزیدییەکان

گۆواری *Anthrops*

بەرگی شەشەم، ساڵی 1911

ڤیەننا - نەمسا

T. 820

Revue Internationale d'Ethnologie et de Linguistique

# ANTHROPOS

Ephemeris Internationalis Ethnologica et Linguistica

Rivista Internazionale d'Etnologia e di Linguistica

Revista Internacional de Etnología y de Lingüística

International Review of Ethnology and Linguistics.

Internationale Zeitschrift für Völker- und Sprachenkunde.

Band / Tom. VI — 1911.

Mit 34 Tafeln
159 Textillustrationen

Avec 34 planches
159 gravures de texte

Im Auftrage der Österreichischen Leo-Gesellschaft.
Mit Unterstützung der Deutschen Görres-Gesellschaft

Herausgegeben:
Unter Mitarbeit zahlreicher Missionäre von P. W. SCHMIDT, S. V. D.

„Anthropos"-Administration: St. Gabriel-Mödling bei Wien, Österreich.

Druck und Verlag der Mechitharisten-Buchdruckerei in Wien, VII.

# La découverte récente des deux livres sacrés des Yézîdis.

Par le P. ANASTASE MARIE, O. Carm., Bagdad.

## Iᵉ PARTIE:

## Quelques remarques sur la découverte et la nature des deux livres sacrés des Yézîdis.

### 1° Comment j'ai été amené à la recherche des deux Manuscrits Yézîdites.

Au mois de mai 1898, un beau jeune homme, aux grands yeux noirs, aux moustaches fortes et bien frisées, au nez aquilin, au teint rose et frais, à la figure avenante, de forme ovale, aux traits réguliers et à la taille colossale et à la constitution robuste; la toute empreinte d'un extérieur montagnard et simple qui dénote une âme forte et généreuse, est venu me trouver pour me demander de l'aider à se faire chrétien.

«Mais alors, à quelle religion appartenez-vous, lui ai-je répondu, si vous n'êtes pas chrétien?»

— Je suis Yézîdi, c'est-à-dire, j'appartiens à cette secte qui vénère le diable dans le but de détourner sa colère de ceux qui lui vouent un culte spécial.

— Je veux bien vous accepter au nombre des chrétiens; mais pour le devenir, il faut vous y préparer en étudiant les principes de la foi du Christ Jésus et en désavouant vos erreurs.

— Je suis prêt à faire tout ce qui vous exigez de moi.

— Quel est votre nom et celui de vos parents?

— Je m'appelle *Ḥabîb*, fils de *Yaʿḳûb* et de *ʿAîšeh*.

— Quel âge avez-vous?

— Environ 30 ans.

— Où êtes-vous né?

— A *Bôzî*, près d'*'Alḳôš*, dans la haute Mésopotamie.

— Qu'est ce qui vous pousse à vous faire chrétien?

— J'ai été domestique et en même temps bibliothécaire chez le chef religieux de ma secte pendant sept ans; puis j'ai trouvé la vie trop monotone et trop insignifiante, je suis allé offrir mes services aux moines chaldéens qui sont dans notre voisinage. Quand je les ai bien connus, j'ai trouvé que leur vie surpasse de beaucoup la nôtre qui ne s'en approche pas du tout. La vie des autres chrétiens me paraissait aussi beaucoup plus élevée que celle de mes plus dévots coreligionnaires.

— Pourquoi ne vous êtes-vous pas fait chrétien là-bas, et êtes-vous venu jusqu'ici?

— Je ne pouvais pas le faire dans mon propre pays; j'aurais été exposé à une mort immédiate.

— Je comprends votre crainte; mais n'avez-vous pas eu un autre motif qui vous ait poussé à renoncer à votre secte pour suivre la doctrine de l'Evangile?



1911 كۆپی لاپەڕەی یەکەمی گوتارەکەی کەرمەلی بە فەرانسی

# بەشی یەکەم

## چەند تێبینییەک دەربارەی چیرۆکی دۆزینەوە و سروشتی دوو کتێبە پیرۆزەکەی ئێزیدییەکان

## I
## چۆن بەشوێن دوو دەستنووسی کتێبی ئێزیدییەکان دا گەڕام ؟

لە مانگی ئایاری ساڵی 1898 کوڕە گەنجێکی چاو ڕەش گەورەی سمێڵ زل و تەواو لوول، لووت چەماوە و روخسار ئاڵ و ڕووخۆش، دەم وچاو خڕ و سیما ئاسایی و باڵایەکی کەتە و پێکهاتەیەکی بەهێز، ڕەنگ و ڕوخساری تەواو دەرەکی چیایانە و ساکارانەی دیاردی بۆ رۆحێکی بەهێز و بەخشندە دەکرد، هاتبوو بمبینێ تا داوام لێبکات یارمەتی بدەم بۆ ئەوەی ببێتە مەسیحی.

( بەڵام ئێوە سەر بە چ ئایینێکن، ئەگەر مەسیحی نین؟ من پێم گوت).

– من ئێزیدیم، واته سەر بە ی تایەفەم[54] کە شەیتان دەپەرستن بەو ئامانجەی کە خۆیان لە تووڕەییەکەی لابدەن و کردویانەتە پەرستنێکی تایبەتی.

– پێم خۆشە لە ناو مەسیحییەکان قەبوولتان بکەم، بەلام بۆ ئەوەی ببیتە مەسیحی دەبێ خۆتی بۆ ئامادە بکەیت و پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی بخوێنی و حاشا لە هەڵەکانی خۆت بکەیت.

– من ئامادەم هەموو ئەوانە جێبەجێ بکەم کە ئێوە لە منی داوا دەکەن.

– ناوی خۆت و باوکت چییە؟

– من ناوم حەبیبە، کوڕی یەعقوب و ئایشەم.

– تەمەنت چەندە؟

– نزیکەی 30 ساڵ.

–لە کوێ لە دایك بوویت؟

– لە بۆزی Bozi، نزیك ئەلقوش، لە میزۆپۆتامیای سەروو.

– چ شتێك هانیدای تا ببیتە مەسیحی؟

من ماوەی حەوت ساڵان نۆکەر و لە هەمان کاتیشدا لای سەرۆکی ئایینی تایەفەکەم کتێبخانەوان[55] بووم ، پاشان زانیم ژیان لەوێ زۆر وەرسکار و بێمانایە چووم خزمەتی ڕاهیبە کلدانییەکان بکەم کە هاوسێ ئێمە بوون. پاش ئەوەی چاك ناسیمن، بۆم دەرکەوت کە ژیانی ئەوان زۆر لە ژیانی ئێمە سەروو ترە و زۆریش لە یەکەوە

---

[54] ڕاستییەکەی ئێزیدی ئایینە نەك تایەفە ( سێکت)، بەلام ئێمە لە سۆنگەی دەستپاکی وەگێڕانەکە ڕێگەمان بە خۆمان نەدا ئەم گۆڕینەیە بکەین، وەرگێڕ.

[55] کتێبخانەوان : bibliothécaire بە عەرەبییەکەی واتەی امین مکتبة دەگەیەنێ، وەرگێڕ.

دوورن. به هەمان شێوە پێم وایە ژیانی مەسیحییەکانی دیکە زۆر بەرزترە لە ژیانی زێدە شەتەکدراوی خوداپەرستانەی ئێمەی ئێزیدی.
– ئەی بۆچی هەر لەوێدا نەبوویتە مەسیحی و تا ئێرە هاتی؟
– لە وڵاتی خۆماندا نەمتوانی ئەوە بکەم، چونکو لەوانەبوو هەر دەمودەست بمکوژن.
– من لە ترسەکەت تێدەگەم، بەڵام ئایا هیچ پاڵنەرێکی دیکە نەبووە پاڵی پێوەنابی تا واز لە ئایینی تایەفەکەی خۆت بهێنی و بە شوێن ئاقیدەی مەسیحدا بکەویت؟
–بەڵێ، هۆیەکی دیکەش هەیە کە کاری تێکردم و منی وا وەرچەرخاند تا لە هەڵەکانی باو و باپیرانم هەڵگەڕێمەوە، ئەویش عیسا–مەسیح[56] خۆی بانگهێشتی کردم کە ئەم ڕێگەیە بگرم.
– ئەوەیان چۆن؟
ئەگەر ئێستە بۆت بگێرمەوە، بڕوام پێناکەیت، چونکو مەسیحیەکان وا فێرکراون هیچ گرینگیەك بە خەونان نەدەن.
– هەرچۆنێك بێت بیگێڕەوە؟
ڕۆژێکیان، ئێوارەی ڕۆژێکی تەواو شەکەت، دوای هەوڵ کۆششێك کە دابووم قوڵ خەوتبووم. لەو خەوەدا خۆم لە ناو باخچەیەکی ڕازاوەی پڕ لە گوڵ و گوڵزار بینییەوە کە درەختەکانی لەبەر بەرەکانیان چەمابوونەوە. هەموو چەشنە گوڵێك و هەموو ڕەنگێك ئەم بەهەشتە پرچێژەیان ڕازاندبۆوە.
" من ویستم لە چێژی جوانی سروشت ورد ببمەوە، لە بەر سێبەری درەختێکی گەورەی تەمەن چەندین سەد ساڵە دانیشتم کە

---

[56] عیسا–مەسیح : Jésus-christ

کەڵایەکانی پڕ بوون لە باڵندەی چکۆڵەی نەغمەخوێن کە یەك بە تەك یەکەوە گۆرانیان دەچڕی.

– لەوکاتانە کە من بە خۆشنوودییەوە بەشداریم لەو پێشبڕکێ دڵخۆشکەرانەیە دەکرد، بینیم پیاوێك پارچە کاغەزێکی rouleau زۆر کراوەی بە دەستەوە بوو و دوو تاڵە تیشکی خۆرەتاویشی بەسەر سەرەوەبوو و پێی گوتم: " بڕوانە ئەم کتێبە ئیدی پێویست بە بوونی ناکات، بە تێپەڕبوونی زەمەن هەمووی هەڵوەشاوەتەوە، منیش ئەم پارچە کاغەزە دەدڕێنم، چونکو کاتی بەسەر چووە و پارچەکانی نابێ بمێنن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە دەیانەوێ دژ بەوانەی بەکاریبهێنن کە وێرای بێکەڵکی و پەرتەوازەبوونی بە هەموو لایەك کەچی هەر دەیانەوێ پابەندی بن".

دوای ئەو، کوڕێکی گەنج بە جل و بەرگێکی برسکەداری ڕوناك خۆی پێشکەش کرد و پێی گوتم : " ڕێگەی ڕاستی و ژیان لە مندا دەدۆزیتەوە. هەتا ئەوکاتەی تۆ لەنا و هەڵەکانی خۆتدا بمێنیتەوە، تۆ هیچ کات ئارامی لە ناو ڕۆحی خۆتدا نابینی، بەڵام هەرکاتێك وازت لێهێنا، تۆ لە ناو خۆتدا خۆشنوودیێکی نەبینراو دەدۆزیتەوە. لەو لای دیکەوە، وات لێدەکەم بەری ئەم درەختە تام بکەیت، پاشان بەری درەختێکی بۆ چنیمەوە کە لە من نزیك بوو، سەوزەیێك کە لای من زۆر بەتام بوو.

دوایی گوتی : " لە ئەمڕۆوە بەدواوە تۆ بەدەر لە بەری ئەم ژیانە، هیچ چێژێکی دیکە نابینی، تۆ سی ساڵەیت و لە یەك ساڵ زێتر ژیانت لەبەردەمدا نەماوە. ئەگەر تۆ هێندە بەدبەختی تا لە ناو

گومڕایی خۆتدا بمێنیتەوە، ئەوا تۆ چ لەم دونیایە و چ لەو دونیای دیکە زیان بە خۆت دەگەیەنی ".

" وەختایەك خۆی کێشایەوە کەسی سێیەم جامانێیکی لە سەرو و سۆلێکی لە پێبوو خۆی پێشکەش کرد، بانگی کردم تا دەرەوەی باخچەکە لەگەڵی.بچم بۆ ئەوەی شتێکی سەیرو سەمەرەم نیشانبدات کە سەرنجی ڕێبوارەکان ڕادەکێشێ، بەڵام هەرکە چەند پێیەك وەشوێنی کەوتم وەخەبەرهاتمەوە، " *من بەو ئەنجامە گەیشتم کەوا عیسا Jésus خۆی بانگهێشتی کردووم تا بچمە سەر ئایینەکەی کە: ژیان، ڕێگە، ڕاستی و ئاشتی لە هەموان نیانتر و لە هەموان ئارامتر هەر لەو ئایینەدایە.* ".

– هەموو ئەو شتانەی گێڕاونەتەوە زادەی خەیاڵکردی وروژاوی ئایینی خۆتە و نابێ هیچ گرینگیەکیان پێبدەی. تاقە شتێك کە بتوانێ ڕاستگۆیی حەزەکانی تۆ بسەلمێنێ، کردەوەکانی خۆتن. ئەگەر ئەو کردەوانە چاکبن و ڕێکبن لەگەڵ ئاقیدەی مەسیحایەتی، ئەوە من ئەوە دەرئەنجام دەکەم کە ئێوە حەزێکی زۆر بەتینتان هەیە بۆ ئەوەی ببنە موریدێکی مەسیح christ خۆ ئەگەر نا هەموو خەونەکانت هیچ ناگەینن، یان بە شێوەیێکی دیکە دیاردی بۆ ئەوە دەکەن کە ئێوە گومڕایێکن بۆ خۆتان.

– باوکە گیان، ئێوە لەسەر هەقن و من هیچ قسەیەکم نییە بیڵێم.

– حەوسەڵەی ئەوەت هەیە هەر ڕۆژ سەعات 5 ی پاشنیوەڕۆ بێیت تا ڕێنوێنییەکانی مەسیحایەتیت فێر بکەم، فێرە نوێژ کردنت دەکەم و وەختایەکیش ئەوەندە فێربوویت، دەبینم بزانم ئایا ئێوە ئامادەیی

ئەوەتان هەیە ئاوی ژیانبەخش[57] وەربگرن. بەڵام بەر لە هەرچی بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوە و بێگومانم لە ئێوە دەوێت کە ئێوە واز لە ئاقیدەی باو و باپیرانتان دەهێنن بەوەی هەموو راز و سیرۆمۆنییەکانی ئایینەکەی خۆتانم بۆ ئاشکرا بکەیت.

حەبیب بۆ وەڵامدانەوەی ئەم دەستپێشخەرییە زۆر لە تەنگەتاویدا کەوت، چونکو هەمیشە ترسی ئەوەی هەبوو و دەترسا نهێنییەکان ئاشکرا بکات کە مورپدەکان دەبێ زۆر بە نهێنی بیپارێزن ئەگەر نا دەکوژرێن. ئەو هەمیشە ئەوەی لە خەیاڵدا بوو کە زوو یا درەنگ دەزانن کە ئەوەیان ئەوە نهێنییەکانی ئاشکرا کردووە و لە تۆڵەی شەرەق ئیهانەکردنی ئاینەکەی دەیگرن. لەمبارەیەوە لە لایەنی خۆمەوە تەواو ئارامم کردەوە و پێم گوت دەتوانێ متمانە بە من بکات کە تا ئەو لە ژیاندا بێ بە هیچ شێوەیێك ناوی نەخەمە سەر کاغەز، بەڵام دوای مردنی ئەگەر ئەو بەر لە من مرد ئەوا دەتوانم هەموو شتێك بڵێم بێئەوەی هیچ لە قسەکانم کەم بکەمەوە.

قوتابییە کاتێشیومێنەکەم catéchumène[58] بەم مەرجانە ڕازی بوو و کەوتە ئەوەی نهێنی سێکتەکەیم بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە بۆ ئاشکرا بکات. منیش دەمودەست دەستم کرد بە نووسینەوەی هەموو ئەو شتانەی ئەو دەیگوتن و بەشێکی زۆریم لە گۆواری المشرق ی عەرەبی باوکە قەدیسەکانی بەیروت ( ساڵی دووەم: لاپەڕەکانی 32-37، 151-156، 309-314، 395-399، 547-553، 651-55، 731-336. ) بڵاوکردەوە.

---

[57] ئاوی ژیانبەخش: l'eau régénératrice

[58] کاتێشیومێن: catéchumène : خوێندکاری بنەمایەکانی ئایینی مەسیحی، وەرگێڕ.

ئەوە لەو کاتە بوو کە حەبیب هێشتا لە ژیاندا بوو، بەڵام کەسێك نەیزانی کە ئەو ڕاستییەکانی بۆ من ئاشکرا کردووە.

## II
## کتێبی پیرۆزی ئێزیدیەکان

خاڵێك کە ڕازگۆ[59] یەکەم لە هەموان زیاتر لەسەری موکوڕ بوو کتێبی ئایینی تایەفەکەیان بوو. تەنها دوای حەوت مانگ لە دوای یەکەمین سەردانی توانیم ناوی کتێبەکانیان لێوەچنگبخەم. دواجار پێی گوتم کە ئەوان دوو کتێبیان هەیە: کتێبی جیلوە و کتێبی مەسحەفا ڕەش، بەڵام بە شێوەیێکی ئاوەها شاردراونەتەوە کە مەحاڵە بزانرێ لە کوێ دانراون و هەر تەنها سێ کەسیش بەم نهێنییە شارەزان: سەرۆکی ئایینی، سەرۆکی کاروباری دونیایی و کتێبخانەوان.

کتێبخانەوان ئەرکی ئەوەی پێسپێردراوە کە هەر شەش مانگ جارێك ئەو کتێبانەی کە هەرگیز خۆریان بەرناکەوێ بخاتە دەرەوە. کتێبخانەکە لەسەر چیای شەنگاڵ یاوەکو چیای ئێزیدیەکانە. کتێبەکانی کتێبخانەکە زۆر کۆنن و بە زۆر زمانی جیا جیا نووسراون: کلدانی، ئاسووری، عەرەبی، فارسی، لاتینی و یۆنانی. (حەبیب نەیتوانی هەموو شتەکانم پێ بلێ چونکو نەخوێندەوار بوو). بە قسەی حەبیب ئەو کتێبانە هی کلێسەیەکی کۆنی شەنگاڵن کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یەکەم دەورانی مەسیحیایەتی. هەرچی

---

[59] ڕازگۆ: révelateur کاشف السر

تایبەت بە دوو دەستنووسی کتێبی ئایینی تایەفەکەیە ئەوا لەناو سندوقێکی دارگوێز دا هەڵگیراون کە بە پارچە وردە پارەی کانزایی داپۆشراوە و بە سێ کلیل دادەخرێ و هەر کلیلێکیشیان لای یەکێك لەو سێ کەسانەیە کە پێشتر باسمانکرد. سندوقەکە بۆ خۆی لەناو ئەشکەوتێکدا شاردراوەتەوە، بەدەستە راستی ئەو کەسەی دەچێتە ژوورەوە بە دوو یا سێ مەتر لە دەرگەی چوونە ژوورەوە لە ناو حەشارگەیێك لە ژێر زەویدایە ، بەشێوەیێك کە تەنها ئەو سندوقەی تێدا شاردراوەتەوە. بەردێکی تەواو موکم حەشارگەکەی داخستووە. بە تەك ئەم سەرپۆشە بەردینە کە بە کارامەیی شوێنەکە دەشارێتەوە کە گەنجینە ئاینەییەکەی تێدایە، کۆمەڵێك بەرد، یەك لە دوای یەك بە دەورەی ئەشکەوتەکە پیرۆزەکە بۆ چەواشەکردنی حەزی ئەو چاوگێڕانەی کە دەیانەوێ بەشوێن گەنجینەکەدا بگەڕێن دانراون.
نزیکەی هەموو ئێزیدییەکان دەزانن کەوا دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە، بەڵام قەدەغەیە ناوەکانی ئاشکرا بکەن ئەگەر نا دەکوژرێن، هیچ کەس رێگەی پێنەدراوە هەوڵبدات ئەم دوو کتێبۆلکە[60] پیرۆزە بخوێنێتەوە. هەروەك چۆن رێگە بە هیچ کام لەو سێ کەسە خاوەن ئیمتیازەش نەدراوە کە لە سێ سەعات زیاتر یەکێك لەم کتێبە سروشیانە révélés لای خۆیان بهێڵنەوە، ئەوەش دەبێ تەنها بە ئامادەبوونی دوو کەسەکەی دیکە بێت.

ئەوەی رێگەی پێدراوە تەنها خوێندنەوەی وەرگێڕاوی عەرەبی کتێبەکانە و هێشتا ئەوەش تەنها یەك کەس هەیە کە بتوانێ بیخوێنێتەوە، ئەویش کوڕە گەورەی سەرۆکی ئایینیانە. زۆربەی

---

[60] کتێبۆلکە: opuscule واتە کتێبۆلکەی ئەدەبی یا زانستی، وەرگێر.

ئەوانەی کە گوێ بیستی ئەم خوێندنەوانە دەبن لێی تیناگەن، چونکو زمانەکەیان دیالێکتێکی کوردی تایبەت بە خۆیانە و تێکەڵاوە لەگەڵ زمانی عەرەبی.

## III
## وەسپی ئەو سندوقە پیرۆزەی کە دوو کتێبە پیرۆزەکەی تێدا هەڵگیراوە

ئەمەیان وەسپی ئەو سندوقەیە کە گەنجینە پیرۆزەکەی تێدا هەڵگیراوە. پێوانەکە بە پێی داوێك گیراوە کە من بە کاتێشیومێنەکەم دابوو، لە ئەنجامدا ئەمە پێوانەیەکی نزیکەییە و پێوانەیێکی ورد نییە. سندوقەکە درێژاییەکەی 33 سم، پانیەکەی 22 سم و قوڵایەکەی یان ئەستوورییەکەی 7 سم. سندوقەکە وەك لە پێشدا گوتمان لە داری گوێزە و بە قەیفە[61] velours یەکی چڵکنی سپی داپۆشراوە. لەسەر سەرپۆشەکە پارچە پارچەی پارە و لە ناوەڕاستەکەشی وێنەی کەلەشێرێکی بەسەرەوەیە کە لە تاوس دەچێ. لە لای ڕاستی ئەو لایەی کە سندوقەکەی لێدەبێتەوە وێنەی خۆرێکی (ڕۆژ) تێدایە، لە لای چەپیشی وێنەی مانگێکی تێدایە. لە سەرووی تاوسەکە، ئەستێرەیێك لەگەڵ تیشکی خۆرەتاو کە وێنەی ئەستێرەی بەیانە. لە خوارەوەش وێنەیەکی زەوییە. لە قوژبنەکانی سەروو و ڕاستدا دوو هێڵی هاوپێچ کێشراون کە نیشانەی ئاون و لەوانەیە دیاردی بن بۆ دەجلە و فورات. لە بەرامبەردا و لە قوژبنی

---

[61] قەیفە velours جۆرە قوماشێکە بە عەرەبی مخمل یا قطیفة- ی پێدەڵێن، وەرگێر.

چەپدا سێ تروسکە دەبینرێن کە ڕەمزن بۆ ئاگر. لە قوژبنی خوارەوە پارچەیەکی خڕ هەیە کە لەوانەیە دەربڕی هەوا بێت، بریتیە لە وێناکردنی ڕەمزی ڕەگەزی ئاو. لەولای تریشیەوە بە لای چەپیەوە، مشتێك دەنکە لمی بیابان لە وردە پارە دەبینرێن. کە وێنای زەوی دەبەخشن. ئەم دەنکە لمانە بەشێوەییەکی وا دانراون کە وێنەی تابلۆییێکی ناڕێك دروست دەکەن.

## IV

### وەسپی کتێبی جیلوە

کتێبی جیلوە یا وەکو کتێبی سروش Livre de révélation لەسەر دوو پارچە کاغەزی پێستی parchemin زۆر ناسك لە پێستی ئاسك نووسراوەتەوە. هەریەکە لەو پارچە جیاجیانە یەك لە دوای یەك پێوانەکەیان نزیکەی 27×11 سم و پێوانەی ئەو بەشەش کە نووسینی لەسەر کراوە تەنها 17×11 سم و هەر لاپەڕەیەکیشی لە 16 دێری تەواو ئاسایی پێکهاتووە. نووسینەکەی زۆر جوان دەخوێندرێتەوە کە بە پیتی تایبەتی نووسراون کە هەندێکیان لە عەرەبی و هەندێکی ترلە عیبری و هەندێك لە کلدانی و دواجار زۆریەیان لە ماندایی mandaïte دەچن. هەر لاپەڕەیەکی لە دوو بەش پێکهاتووە کە یەکێکیان نووسراوە و ئەوەی دیکەی سپییە. بەشە سپییەکە بە شێوەییێك بڕاوە کە دەربڕی هەمان ئەو وێنانە بێ کە لەسەر خودی سندوقەکەدا دەبینرێن، بەمشێوەیە:

یەکەم وێنە، مانگێکی یەکشەوە یا هەر مانگێك دەنوێنێ،

دووەم وێنە، ئەستێرەییێك کە بێگومان ئەستێرەی بەیانە،

سێیەم وێنە، باڵندەییێك کە لەوانەیە تاوس بێت،
چوارەم وێنە، زەوییێکی پان وەکو تابلۆییێکی ناڕێك،
پێنجەم وێنە، خۆر،
شەشەم وێنە، دوو زەریا کە لەوانەیە دەجلە و فورات بن،
حەوتەم وێنە، سەری مرۆڤێیك لە گەڵ دوو گوێ یا دوو شاخ ( شەیتان ؟)،
هەشتەم وێنە، گوڵە شلێرەییێك lis بە سێ گەڵاوە یا وەکو زێتر سێ بروسکەی ئاگر کە لە خوارەوە یەکیان گرتووە.
لە خوارەوەی هەر لاپەرەیەکیشدا ئەو وشەیە نووسراوەتەوە کە لە لاپەڕەی دواتر دەستپێدەکات. لاپەرەکان هیچیان ژمارەیان لەسەر نەنووسراوە تا ریزبەندی لاپەڕەکان دیاری بکات.

## V

### وشەیەك دەربارەی مانای ئەم هێمایانە

ئەو هێمایانەی کە لەسەر سندوقە پیرۆزەکە دەبینرێن و بەسەر هەریەکە لە لاپەرەکانی کتێبی جیلوەش دووبارە کراونەتەوە و پێوەی نووسراون چی دەگەیەنن؟
– دەتوانین کۆمەڵێك بیرورا لەمبارەیەوە دەربڕین، بەڵام ئەوەی لای من لە هەمووان زیاتر ڕێی تێدەچێ ئەوەیە کە ئێزیدییەکان چوار رەگەز بە پیرۆز دادەنێن: خۆر، مانگ، ئەستێرەی بەیان و ڕۆحی خراپە لە ناو دوو وێنەی کەلەشێر یان تاوسدا یا وەکو زێتر لە ناو کەلەشێر–تاوسدا، ئەو فریشتەیەی کە بەشێوەییێکی کاتی لە پایەی خۆی هێنرایە خوارەوە بۆ ئەوەی کۆتایی دونیا بگرێتەدەست. لە

خوێندنـەوەی هـەردوو کتێبـە پیرۆزەکانیـان دەبیـنین ئـەم پەرسـتنە هەرچەندە کەم ئاشکرایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوندە لە ڕاستییەوە کـەمتر نییـە و کۆمـەڵێك لـە کەسایەتییە پانتیۆنـەکانیان[62] هـەڵگری ناوگـەلێکن کە بوونەتە مایەی پیرۆزییەك بۆ پەرستنی ئەستێرەکان. ئایا ئەوانـە کەسـایەتی مێـژوویی و ئەفسانەیین؟ – مـن هیچـی لـێ نازانم– ئایا ئەگەر کەسایەتی مێژوویین هـەڵگری نـاوی ڕاستەقینەی دەورانـی زینـدەگی خۆیـانن یـاوەکو کـەم یـا زۆر دوای مردنیـان ئـەم ناوانەیان پێبەخشراوە؟ من هێشتا ئەوەشیان نازانم. کەوایە ئەمانە پرسیارگەلێکن کـە دەبێ دواتر کەسـانی دیکە دەرفـەتی ئـەویان ببێ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم ئایینە نامۆیە بکەن و ڕوناکیان بخەنە سەر. بە هەرحاڵ ئەوەی هیچ گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە ئێزیدییەکان هێشتا لـە ڕۆژی ئێسـتەشماندا جەسـتە ئاسمانییـەکان[63] و چـوار ڕەگـەزە کۆنەکە دەپەرستن، ئەوەی کە تەواو هاوجوتە لەگەڵ ئەو نیشانانەی کە لە پێشدا باسکران. لـە بارەی دەستنووسـی یەکەم و هێمایـەکانی ئەوەنــدە بەســە و بــا ئێسـتە بچـینە سـەر وەسـپکردنی دووەم دەستنووس کە پێی دەڵێن مەسحەفا ڕەش.

## VI

### وەسپی دەستنووسەکە

[62] پانتیۆن panthéon واتە کەسایەتییە ناودار و مێژووییەکانی نەتەوەیێك، وەرگێڕ.

[63] جەستە ئاسمانییەکان : Les corps célestes

مەسحەفا ڕەش یا کتێبی ڕەش Livre Noir پارچە کاغەزێکی پێستە لە هەمان ئەو چۆنایەتیەی کە لە پێشدا باسکراوە، 2.80 سم درێژی، لەسەر 21 سم پانی. پانی بەشی نووسینەکە 11 سم. هەمووی بەسەریەکەوە 152 سم درێژە، بەڵام پیتەکانی کەمێك گەورەترن.

تێکرای ئەم وردەکاریانە لە لایەن حەبیب خۆیی پێم گەیشتوون، بەڵام من تا ساڵی 1906 نەمتوانی بیرۆکەیەکی تەواوم لەبارەیەوە هەبێت، وەك لە دواتر باسی دەکەم تا ئەو کاتەی توانیم کتێبخانەوانێکی دیکە ببینم کە وەرامی هەموو ئارەزووەکانی منی دایەوە.

## VII

### کام لەم دوو دەستنووسانە کۆنترن؟

لەم دوو نووسراوەدا کە نە ناوی نووسیار و نە ساڵی نووسینی بەسەرەوەیە کە کەی نووسراون. کەوابوو، چۆن بتوانین حوکم بەسەر کۆنێتی هەریەکەیان بدەین؟ لەوانەیە لە ڕێگەی زمان و ژمارەی ئەو وشانەی کە کەوتوونەتە ناو دیالێکتی پیرۆزی ئێزیدییەوە بتوانین بەم ئەنجامە بگەین. بەڵام ئەگەر ئەم نیشانە وەکو پێوانەیێك وەربگرین ئەوا بە هیچ ئەنجامێکی وا دڵخۆشکەر ناگەین، چونکو وا دیارە کە زمانی هەردوو نووسراوەکە بە هیچ شێوەیێك یەك نەبن. ڕاستیەکەی لە هەردووکیاندا وشەی نامۆ هەن. کەوایە دەبێ دەست لەم نیشانەیە هەڵبگرین و بەدوای نیشانەییێکی دیکەدا بگەڕێین، وەکوو بیرۆکە idées بە نموونە.

کەوابوو، لە کتێبی جیلوەدا وادەردەکەوێ کە بیرۆکەکان زۆر ڕەسەنتر و ئاقیدەکە زۆر ڕەسەن تر بێت. ڕاستیەکەی لەم نووسراوەدا ( مەبەست لە کتێبی جیلوەیە، وەرگێڕ) بیرۆکەی وای تێدایە کە لە ناو مەسحەفا رەشدا نییە. هەرچی لە مەسحەفا ڕەشە، بیرەکان بە پێچەوانەوە زۆر ڕەشۆکین. کەوایە وادەرناکەوێ کە ئەو هێندەی من درکم پێکردبێ یەکەم نووسیاری ئێزدییەکان تێگەیشتنێکی ئەو هێندە گشتیی و ئەوهێندە ئاسایی هەبووبێت.

من بۆ ئەوە دەچم باوەڕ بەوە بکەم کە کتێبی جیلوە کۆنترە، هەڵبەت بە بێ ئەوەی بتوانم پرسەکە یەکلا بکەمەوە. ئەمە بیر و ڕایەکی سادەی خۆمە و وەك هەوڵدانێك بۆ تاقیکردنەوە دەیخەمە روو. خەڵکانێکی دیکەی لەمن دەست ڕۆیشتووتر، دەتوانن ئەم تێزە لە من چاکتر زۆر ئیقناع پێکەرانەتر بسەلمێنن. دەبێ ئەوەش زێدە بکەم کەوا کتێبی جیلوە هێشتا کەمتر ناسراوە لە لای ئێزدییەکان وەك لە کتێبی مەسحەفا ڕەش، ئەوەی کە ئەم بۆچوونە زیاتر دەسەپێنێ ئەوەیە کە ئەم کتێبە لە لای ڕێبەرەکانی ئەم سێکتە پیرۆزتر و پەرستراوترە، بەجۆرێك ئەوەندە بەتەنگیەوەن کە لەبەر چاوی خەڵکی بشارنەوە.

## VIII

### حەبیب: ئەو ئێزیدیەی بە ناوی عبدالمسیح بوو بە مەسیحی

با بگەڕێنەوە لای حەبیب، ئەو کوڕە گەنجەی کە بە ئاسانی هەموو پرەنسیپەکانی ئایینی مەسیحی وەرگرت لەگەڵ نوێژە هەرە

پێویستەکان و لە 24 ی دیسامبەری 1898 لە ڕۆژی پێش جەژنی نوێل حەبیب باتێمی وەرگرت.
R.P. Augustin Syeger دۆمینیکی خەڵکی بەغدا وەك من، لەسەر ڕێگەپێدانی Mge. Aayner دۆمینیکی ئەلزاسی کە ئەو کات ئەرشەفێکی لاتینی بەغدا و نوماینەدەی پاپا[64] بوو لە میزۆپۆتامیا باتێمی کرد. لە ناوی حەبیب ( خۆشەویست) ناوی عبدالمسیح ( Christude) مان بۆ ئیزافە کرد بۆ ئەوەی تا هەتا هەتایە ببێتە خزمەتکاری مەسیح، دوای ئەوەی ماوەیێکی زۆر کۆیلەی شەیتان بوو. حەبیب دوای باتێمکردنەکەی لە شەوی نوێل لە لایەن کۆمیونیۆنی پیرۆزەوە sainte communion دووپاتکردنەوەی بۆ هات و بەردەوام بوو لە رازە پیرۆزەکان sacrement و ژیانێکی تەواو مەسیحیانە دەژیا. لە بەغدا وەك دەرگەوانی کۆشکی نوماینەدە Mgr. Alteyer دامەزرا.

عبدالمسیح بوو بە مەسیحی و عابیدێکی تەواو، ڕۆژێکیان پێی گوتم: " باوکەکەم ئێوە دەرگەی کنێسەی کاتۆلیك یان ڕاستتر دەرگەی ئاسمانتان بۆ والاکردمەوە، حەزدەکەم بەردەوام کوڕی وەفاداری ئێوە بم، بەوەی ئەو زانیاریانە تەواو بکەم کە پێمدابووی".

## IX
### مەرگی عبدالمسیح

---

[64] نوماینەدەی پاپا : délégué apostolique

عبدالمسیح وێڕای پێکهاتەییێکی بەهێز، کەچی دوای بە مسیحی بوونەکەی زۆر نەژیا. هەمیشە ئەو بیرەی لە مێشکدا بوو کە دەبێ یەك ساڵ دوای باتێمەکەی بمرێ، ئەو تێبینییەی کە لەوەتای وەك دەڵێن ئەو خەونەی کە بانگهێشتی لێکرابوو تا ببێتە موریدی مەسیحی فریادرەس Christ-Rédepler کە لەساوە تێگەیشتبوو کە هەر تەنها نزیکەی ساڵێك زیاتر لە دوای مەسیحیبوونەکەی زیاتر ناژی، ئەوەی کە دەبێ هەرچی زووترە بیکات ئەگەرنا بەر نەفرەتێکی هەمیشەیی دەکەوێ. ڕاستیەکەی، عبدالمسیح ڕۆژی 9 ی ئۆکتۆبەری 1899 نزیکەی نۆ مانگ و نیو دوای بە مەسیحیبوونەکەی بەهۆی خوێن لەبەر ڕۆیشتنێکی بەهێز کە دەرەتانی لێبڕیبوو، مرد.

# X

## وەرگێڕاوی عەرەبیی کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدییەکان

مانگێك بەر لە مردنی ڕۆژێکیان عبدالمسیح پێی گوتم کە هەردوو کتێبە پیرۆزەکەی ئێزیدیەکان ماوەییێکی زۆرە کراونەتە عەرەبی و بۆیەش وەرگێردراون بۆ ئەوەی ئەو دوو کتێبە پیرۆزەی کە لە دەورانی ئادەمەوە لە لایەن خودا خۆی نووسراون و هاتوونەتە خوارەوە، نەکەونە بەرچاو و دەستتان. وەرگێڕانەکە بە نزیکەیی وەکوو خۆیەتی. ئەوکاتانە کراوە بە عەرەبی کە زمانی ئەم تایەفەیە ناسراو بووە. لە لایەن ئێزیدییێك کە زمانی عەرەبی لە یەکێك لە قوتابخانە مەسیحییەکانی موسل خوێندووە و لەبەر ئۆریژینالە ئەسلیەکە گیراوەتەوە کە لەلایەن سەرۆکی ئایینان پارێزراوە و برێك

جاریش لەناو سندوقە پیرۆزەکە لەگەڵ کتێبە خوداییەکانی دیکە پارێزراوە".

" هەتاوەکو کتێبە وەرگێڕاوەکانیش نابێ بدرێنە دەست کەسانی غەیرە دین profanes، من لێتان دەپاڕێمەوە، باوکەکەم، (عبدالمسیح درێژەی پێدەدات) کە بە هیچ شێوەیێك تا من لە ژیاندا بم چاپیان نەکەن".

## XI

### چارەنووسی کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدییەکان دوای بڵاوکردنەوەیان

دەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم، ( تازە کارە ئایینیەکەم دەڵێ) کە من زۆر جاران لە سەرۆکی ئایینی باڵای خۆمانم بیستووە کە دووبارەی کردۆتەوە کە دەبێ بە شێوەیەکی قەتعی و بە گەورەترین سوێند نکوڵی لە هەبوونی کتێبی پیرۆز بکەین لە ناو ئایینی ئێمەدا. هەتاوەکو دەبێ بە شێوەییێکی زۆر نهێنی ناوەکانیشیان بپارێزین.

" چەندین ئێزیدی بە سەختترین شێوە ئەشکەنجە دراون و مەرگی پڕ جەفایان چەشتووە هەر لەبەر ئەوەی ناوی کتێبە ئایینیەکانیان ئاشکرا کردووە، مێژووی نووسراوی بێگانەکانیش دەبێتە بەڵگە". هەمان سەرۆکی باڵا لە زۆر بۆنەدا ئەوەی دووپاتە دەکردەوە کە ئەگەر کتێبەکان دزران ئەوا دەبێ دەستەوجێ ئەو شوێنەی کە سندوقەکەی تێدا هەڵگیراوە تێك و پێکبدەن، ئەگەر سندوقەکە دوای ونبوونی ئەو پارچە کاغەزانەی کە تێدابووە مایەوە، ئەوا دەبێ دەستەو جێ هەرکە پێی زانرا ئاور لە قاسە چکۆلانەکە بەربدەین و ئەو شوێنە پیرۆزەی کە سندوقەکەی تێدا شاردراوەتەوە تێك و پێك

بـدەن، خـۆ ئەگـەر دواجـار لاپـەرە خوداییـەکان لەبـەریان گیرایـەوە یاخوود بەمشێوەیە یان بە شێوەیێکی دیکە کەوتنە بەردەستی خەڵك و چاپکرانەوە، ئـەوا دەبـێ دەسـتەوجێ دوای ئاگـاداربوون هـەمووی توڕ هەڵدەینە ناو ئاورێکی پیرۆزەوە".

منیش لێم پرسی جا ئـەم هـەموو خۆپارێزییە لە پای چی: کەوا ئاشکرایە بێهوودە و بێسوودە.

وەرامی دامەوە: " چونکو لە ناو کتێبە خواییەکانی ئێزیدیەکان ئـەوە هـاتووە کـە هـەموو ئایینـەکان هەڵـەن و ئەوانـەش وەك ئـەوەی ناویان دەنێن پێغەمبەرەکان جگە لە کەسانی گومڕا کەم و زۆر فێلباز زێـتر هیچــی دیکــە نـین و بۆیــە ئەگــەر موســلمانەکان یــا وەکو مەســیحییەکان ئــەم بۆچــوونانە بــزانن، ئــەوا جــاڕی لــە خــوێن هەڵکێشانیان و فەرمانی ڕەشەکوژیێکی گشتیان بۆ دەردەکەن".

بەمپێیە لە سایەی درۆیـەکانیان کـە وەکـو ڕێگەپێـدراوی دادەنـێن، دەرفەتی ئـەوەی بـە پیـاوە ئـایینی و پیرۆزەکانیـان داوە کـە بتـوانن تـا ڕۆژی ئـەمرۆ ڕازی پەرستنەکان و سـەربەخۆیی نیشـتمانیان بپـارێزن. پیـاوە ئایینەییـەکانیان هـەموو نووسـراوەکان دەفـەوتێنن تـەنها بـۆ ئـەوەی ئەوقسـانە بـە درۆخەنـەوە بکـەن کەلەبارەیانـەوە دەگـوترێ. ڕاستیەکەی ئـەوان نەتـوانن پـێش ڕودانـی نەگبەتییەکـە دەنگـۆی وا بڵاوبکەنـەوە، بـۆ ئـەوەی هێشـتا زۆر کارامانـەتر ئـەو سندوقە پیرۆزە بشـارنەوە کـە لـە ژیـانی خۆیـان زیـاتر خۆشـیاندەوێ، چـونکو ئەمـە تاڵی پیرۆزی[65] ئەوانە. وەختایەکیش داوایان لێدەکرێ داخۆ کتێبی

---

[65] تاڵی پیرۆز: arche d'alliance ئەو سندوقەیە کە جولەکەکان کتێبی لەوحەی دە ئامۆژگاریەکانی خۆیان تێدا هەڵدەگرت، وەرگێر.

پیرۆز یا نووسراوی سروشیان هەیە، بە گەورەترین سوێند نکوڵی لێدەکەن، خۆ ئەگەر پێشدا بگیرێ و هیچ بوارێکیان لەبەردەمدا نەمێنێتەوە ئەوا چەند دەستنووسێکی گۆرانی کوردی یا گۆرانی عەرەبی یا وەکی دیکە شتێکی لەو چەشنە دەخەنە بەردەس کەسە چاوبگێرەکە بۆ ئەوەی لە کورتیدا وەڵامی ئەو پرسیارانە بپرنەوە کە زۆر جارپسیان دەکات.

بە هەمان شێوە ماندیەکانیش کە بە ناوی بازاڕی سوبا Subbâ ناسراون لە بەرامبەر ئەو بێگانانەی کە دەیانەوێ سێکتەکەیان بناسن هەمان ڕەفتار دەکەن.

بەمجۆرە هەرگیز نەتوانراوە بزانرێ ئێزیدیەکان کێن؟ باوەڕیان چییە، چی پەسن دەکەن لە عەقیدەکەیان و چلۆن بیر لە سوژەی ئایینەکانی دیکەی جیهان و نووسەرەکانیان دەکەنەوە.

عبدالمسیح ڕێگەی دام دوو کتێبۆلکە پیرۆزەکەیان ترەنسکسپیزە بکەم کە من بە نهێنی کۆپیەکم لێیان گلدایەوە، بەبێ ئەوەی ڕێگەی دابم بەشێوەیەك لە شێوەکان بڵاوی بکەمەوە یا وەکو هەتا گوتنی ئەوش کە بڵێم من ئەم کتێبانەم هەیە.

## XII

### دەستنووسێکی دووەمی عەرەبیی نووسراوەکانی ئێزیدیەکان

لە مانگی ئایاری 1904 دەرفەتی ئەوم بۆ هەڵکەوت سەرێکی موسڵ بدەم. بەوپێیەی ناسیاویم لەگەڵ بەڕێز عەزیز قەس یوسف، وەرگێڕی کونسلخانەی فرانسا هەبوو، داوام لێکرد ئەگەر بتوانێ برێك زانیاریم لەبارەی ئێزیدیەکان بداتێ. پێی گوتم: " هیچ

زانیارییەك جێگەی ئەوە ناگرێتەوە لەوەی كە عەقیدەكەیان لە ناو كتێبە تایبەتیەكانیاندا بخوێنیتەوە. من كۆپییەكی كتێبە وەرگێڕاوەكانیانم لا هەیە". پێم وابوو شۆخیم لەگەڵدا دەكات،بەڵام وەختایەك لە چەكمەزەكەی ئەو دەفتەرەی دەرهێنا كە لە ناو چەكمەزەكەی بوو زۆر سەرسام بووم.

من دەستنووسەكەی یەكەمی خۆم لەگەڵدا نەبوو ( بنۆرە بەشی دەیەم ) تا لەگەڵ ئەوەی وەرگێڕەكە بەیەكەوەیان بگرم. هەر دەمودەست مشوری ئەوەم خوارد كۆپیەكی وشە بە وشەم لەبەری گرتەوە تا وەكو بە وردی لەگەڵ ئەوەی خۆم بەراوردی بكەم.

ئەو دەستنووسەی كە من ناوی دەنێم دەستنووسی موسل[66] زۆر پڕ هەڵەتر بوو. لە تێرمەكانی دا چەند شت گەلێكی نوێیان تێدابوو، بەڵكو هەر زۆر تازەش بوون، ئەو دەستنووسەی كە من ناوی دەنێم دەستنووسی شەنگاڵ زۆر تەواو ترە.

## XIII

### وەچنگخستنی دەستنووسە ئۆریژینالەكان

---

[66] بە گوێرەی زانیاریەكانی گیست ئەم دەستنووسەی عەزیز قەس یوسف بە دەستی كەوتووە كاتی خۆی لە ناو كاغەزە كۆنەكانی سەرۆكێكی ئێزیدیەكان بووە و لە كاتی لەشكركێشییەكی سوپای عوسمانی دەستیان بەسەردا گرتووە و دواتر عەزیز قەس یوسف توانیویە كۆپییەك لەبەر ئەم دەستنووسە بگرێتەوە، بڕوانە: Guest, John S., Guest, *The Yezidis: A Study in Survival*, Ed. KPI, London & New York, 1987, p.153.

له دوادواییه‌که‌ی مانگی حوزه‌یرانی 1904 من موسڵم به‌جێهێشت بۆ ئه‌وه‌ی له ڕێگه‌ی بیابان به شه‌نگال، دێرزور، حه‌له‌ب و به‌یروته‌وه بچمه ڕۆما.

کاتێک گه‌یشتمه شه‌نگال چووم شێخی ئێزیدییه‌کان ببینم، شه‌یتانێکی گه‌وره بوو بۆ خۆی، دوو چاوی گه‌وره و ڕه‌ش و پرچێکی درێژ. ڕۆبێکی سپی گه‌وره‌ی پۆشیبوو که که‌ڵێنێکی گه‌وره‌ی به ناوچه‌ی سنگییه‌وه بوو که له‌ڕێوه سینه پڕ مووه‌که‌ی لێوه دیاربوو. به عه‌ره‌بییه‌کی چاک ده‌ئاخاوت و زۆر به گه‌رمی پێشوازی لێکردم و به لێشاو پرسیاری لێده‌کردم که من به شێوه‌یه‌کی نه‌زاکه‌ت، کورتبڕ، نا ڕۆشن و بێلایه‌نانه هه‌موویم وه‌ڵام دایه‌وه. بۆ ئه‌وه‌ی به‌رده‌وام نه‌بێ من بداته به‌ر ڕێژنه‌ی پرسیاران که من ئامانجێکم تێدا نه‌ده‌بینی، منیش له لایه‌نی خۆمه‌وه ده‌ستمکرد به پرسیارلێکردن بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ینه ئه‌نجامێکی پۆزه‌تیڤ. له کاتی گه‌ڕانه‌وه‌م بۆ ژێر ڕه‌شماڵه‌که‌م هه‌موویم یادداشتکردن و تکام له کتێبخانه‌وانه‌که کرد ده‌وروبه‌ری ئێواره بێت بمبینێ و واده‌م پێدا که به‌خشیشی بده‌مێ. ئێواره کتێبخانه‌وانه‌که به‌ر له واده‌ی خۆی هات بمبینێ، چونکه وشه‌ی به‌خشیش قاچه‌کان چوست ده‌کات و ده‌رمانی به‌ناوبانگه وه‌ک پادشای هه‌موو وڵاتان بۆ به‌ته‌نگه‌وه‌هاتنی سستی خه‌ڵک و له هه‌مان کاتیشدا بۆ دنه‌دانی چالاکیه‌کی گه‌وره .

وه‌ختاییه‌ک هات و له ته‌نیشتمه‌وه دانیشت و زانیم که هه‌ردووکمان به ته‌نهاین، هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی ده‌رباره‌ی ئێزیدییه‌کان ده‌مزانی پێم گوت، کتێبه‌کانیان، کتێبخانه‌که‌یان هتد... عبدالمسیح مردبوو ئیدی هیچ نه‌ده‌ترسام نه بۆ ئه‌م و نه بۆ خۆم. واده‌ی 20

فرەنکم پێدا بۆ هەر لاپەرەییێکی کتێبی جیلوە و 300 فرەنکیش بۆ ترەنسکرپسیۆنی مەسحەفا رەش کە هەمووی بەسەر یەکەوە 460 فرەنکی دەکرد لەگەڵ 40 فرەنک وەك بەخشیش کە هەمووی بەسەریەکەوە بری 500 فرەنکێکی چاکی دەکرد. ئەو کە هەرگیز گوێ بیستی پارەییێکی ئاوەها نەبوو ڕازی بوو. کاغەزی تەنك (شەفاف)م پێدا تا وەکو خۆی بە دەستپاکی و دەقاودەق وەکو خۆی servilement ئەو لاپەرانەی مەبەستن بیانوسێتەوە بە بێ ئەوەی هیچ شتێك لە یاد بکات و نە هیچێکیشی بۆ زیاد بکات و نە هیچێکیشی لێ کەم بکاتەوە. ئەم کتێبخانەوانە ناوی حەمۆ Hammu بوو ئەویش دوو ساڵێك بەر لە ئێستە مرد و عەرەبییێکی چاکی دەزانی و لەلای مەلایەکی نزیك بە شەنگاڵ فێری خوێندنەوە و نووسین بوو بوو و لە ئەنجامدا لە نووسیندا کارامە بوو.

لەبارەی مەسحەفا ڕەش وەك چۆن بریتیبوو لە پارچە کاغەز، ئەویش بە هەمان شێوە دەستپاکانە کۆپی کردبوو و لەسەر شێوەی یەکەم، واتە هەر لاپەرەییەکی بۆ کۆپی دەکردم، لە خوارەوەی هەر لاپەرەیەکەدا ئەو وشەیەی دەنووسییەوە کە دەبوو سەرەتای لاپەری دواتر بەو وشەیە دەسپێبکات. ئەمکارە ماوەی دوو ساڵی کێشا، چونکو کتێبخانەوانەکە لە ساڵێکدا هەر تەنها چەند ڕۆژێك دەیتوانی دەستنووسەکە ببینێ و ئەو ڕۆژانەش زۆر دەگمەن بوون. بە پێی توانای تەواوکردنی، لاپەڕەکانی یەك لە دوای یەك بۆ دەهێنام و منیش بە هەمان شێوە پارەکانم دەدایێ. بەمشێوەیە دەتوانم بلێم ئەم کتێبەی ئێستە لەبەردەستدایە یەکێك لە گەنجینە گەورەکانی ئەدەبیاتی سەدەی ئێمەیە و نهێنترین رازی جیهانە و شایستەی

ئەوەیە کت ومت وەك خۆی بێت و ئێستەکە دەتوانین بزانین ئاینی ئێزیدی چییە کە تا وەکو ڕۆژی ئەمڕۆمان لە قوژبنێکی هەرە تاریکی جیهانی ئاینی شاردرابۆوە.

## XIV

### چۆن نووسینە ئێزیدییەکانم لێکدایەوە

وەختایەك ئەم دوو دەستنووسەم بەردەست کەوت، بە هیچ شێوەیەك نەمتوانی نووسینەکەی بخوێنمەوە. پیتەکان بۆ من تەواو نەناسراو بوون، هەموو ئەلفبێ بەردەست و خەیالیەکانم وەبندەستخست بەڵام ئەنجامێکی وای نەبوو. لە وتووێژەکانم لەگەڵ بەڕێز لویی ماسینۆن، ئەو کەنجە ڕۆژهەڵاتناسە فرانسەویە بە منی گوت: " مادام ئێوە وەرگێڕاوە عەرەبییەکەتان هەیە ئیدی ئێوە تەنها ئەوەتان لەسەرە بەدوای ناوە عەلەمەکاندا بگەڕێن بۆ ئەوەی کلیلەکانتان دەستبکەوێ". بێگومان دوای ئەوەی وەرگێڕاوە عەرەبییەکەم بەدەست گەیشت لەگەڵ ئەم کارەدا خوێندنەوەکەی تەنها یاریەکی منداڵانە بوو[67].

[67] بەڕاستی لەمبارەیەوە من بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ کەرمەلی-دا نیم، کێ دەڵێ وەرگێڕاوە عەرەبییەکە بە ئەمانەتەوە کراوە و کێ دەتوانی گەرەنتی ئەوە بدات کە تێکستە بە عەرەبیکراوەکە زیاد و کەمی بۆ نەکراوە؟ دەبوو کەرمەلی بیگوتبایە ئێمە لە ناچارییەوە پەنامان بۆ وەرگێڕاوە عەرەبییەکە بردووە دەنا تێکستە بە عەرەبی کراوەکە هەرگیز جێگەی تێکستە کوردییەکە ناگرێتەوە، وەرگێڕ.

# XV

## دیالێکتی پیرۆزی کۆنی ئێزیدییەکان

من هەستام هەموو دەقەکانم لێکدایەوە و لەسەر دەفتەرێکی یاداشتنووسی بە پیتی عەرەبی ڕوونووسم کردن. کەوتمە بەرامبەر بە زمانێک کە لێی تێنەدەگەیشتم، نە فارسی، نە عەرەبی و نە تورکی بوو، تێکەڵاوێک بوو لەم سێ زمانە و تێرمی دیکە کە لە ناو هیچ فەرهەنگێک لەو فەرهەنگانەی لەبەر دەستم دابوون نەبوون. دواجار زانیم کە ئەمە دیالێکتێکە لە زمانی کوردیی کۆن دەچێ کە ئەمرۆ قسەی پێناکرێ و وشەکانی لە ناو زۆر لە دیالێکتەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە.

ئێمە لە بەغدا 5000 کوردمان لە خێڵ و تیرەی جیاجیا هەیە، لە سایەی ئەوان و بەهۆی زۆری پرسیارکردنەکانم گەیشتمە ئەوەی لە واتەی گشتی هەردوو دەستنووسەکە تێبگەم کە بێگومان وەک هەمیشە هاوجووت نییە لەگەڵ ڕێنووسەکەی. هەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم کە بە ئاسانی هەر وەک لە وەرگێڕانە عەرەبییەکە پاشماوەی بیرەکانم بۆ نەدەدۆزرایەوە. دەبێ دانیش بەوەدا بنێم کە من وەرگێڕانە ئازادەکانم لە ڕووی وەرگێڕاوە عەرەبییەکە وەرگێڕاون نەوەک لە ڕووی ئۆریژیناڵە کوردییەکە کە ئێستەکەشی لەگەڵدا بێ زۆر ئاشکرا نیین.

مشووری لێکۆڵینەوەی قووڵتر دەربارەی دیالێکتی پیرۆزی کۆنی ئێزیدییەکان بۆ ڕۆژهەڵاتناسەکانی دیکە جێدەهێڵم کە لە ئێزیدی مۆدێرن جیاوازە و من لە گۆواری *المشرق* چەند نموونەیەکم لێ

بڵاوکردنەوە. من بەو پێیەی نە زمانی فارسی و نە تورکی نازانم زۆر خۆ نزمگرانە دان بەوەدا دەنێم کە من هەتا ئەوەش نیم کە ئەم پرسە بخەمە بەر روناکی تەنها مەگەر چەند مانگێك خۆم بۆ ئەوانە تەرخان بکەم[68].

## XVI

### وشەیێک دەربارەی ئەلفبێی ئێزیدیاتی

ئەوەی یەکەمجار ئەم نووسینە ببینێ سەرسام دەبێ، نیشانەی جیاکەرەوەی ئەم نوسینە ئەوەیە پیتەکانی خاڵ یا نیشانەی زێدەکاریان بەسەرەوە نییە کە پیتێك لە یەکێکی دیکە جیابکاتەوە کە لەو بچێ، هەر وەك لە زمانی عەرەبیدا وایە. ئەم نیشانەیە بە تەنیا

---

[68] بەڕێز M. Bittner لە زانکۆی ڤیەننا کە لێهاتوویی زۆر و شارەزایی لە چەند زمانێکی سامی و تورکی، لە ئەرمەنی، فارسی تەواو ناسراوە ( بە تایبەت بروانە ئەو میتۆدەی کە لە نووسراوەکەی خۆیدا بەکارهێناوە " *Der vom Himmel gefallene Brief* *.Christi in seinen morgenländischen Versionen und Rezensionen* Denkschriften dre Kaiserl. Akademie d. Wiss. In Wien, phil-hist.kl, Bd LI, Abt. !) میهرەبانی نواند کە خۆی تەرخانکرد بۆ ئەوەی وەرگێرانێکی تەواوی تێکستە ئۆریژیناڵە کوردیەکە بڵاوبکاتەوە و لێکدانەوەی گشتگیری بۆ ئیزافە بکات و لە هەموو وردەکارییە فیلۆلۆژی و زمانەوانییەکان بکۆڵێتەوە. ئەمکارە دەبێتە بەرگێکی (Bibliothèque –Anthropos) دەشێ- وەك چۆن بەڕێز پرۆفیسۆر م. بیتنەر ئێستەکە خەریکە بۆ دوایەمین جار دەست بەکارەکەیدا بگێڕێتەوە- لە یەکەم مانگەکانی ساڵی 1911 بڵاوببێتەوە. بە هەمان شێوە لە ناو ئەم بەرگەدا کۆپی عەرەبی دەستنوسی شەنگاڵ بڵاودەبێتەوە کە ئەنستانس ماری کەرمەلی بۆی ناردووین هاوڕێ لە خوارەوەی هەر لاپەرەیەکدا خوێندنەوەیێکی وەرگێڕاوە عەرەبییەکەی موسل بڵاودەکرێتەوە.

بەسە بۆ ئەوەی بگوترێ ئەم ئەلفبێیە کۆنە یا وەکو لە سیستەمی ئەلفبێیێک وەرگیراوە کە تازە نییە.

بۆچی ئێزیدیەکان ئەم فۆرمە نوێیەی ئەلفبێیان گونجاندووە و لە کوێیان هێناوە؟ لێکدانەوەی هۆیەکەی ئاسانە: ئێزیدیەکان دەوربەریان هەمووی کۆمیونیتەی ئایینی هەمەچەشنەیە و هەر یەکێکیشیان سیستەمی نووسینی تایبەت بە خۆیان هەیە. زیاد لەوەش، ئەم شەیتان پەرستانە عەقیدەیەکی زۆر سەیر و سەمەرەیان هەیە کە بە شێوەییێکی بەرچاو لە ئایینەکانی دیکەیان جیادەکاتەوە. راستیەکەی، ئەم شەیتان پەرستانە بوونەتە سۆنگەی بە سووک چاولێکردن و تۆقین لە لایەن ئایینەکانی دیکەوە.

وا دیارە ئێزیدییەکان ناچاربوونە سیستەمێکی نوێ پێرەو بکەن بۆ ئەوەی کتێبەکانیان ئەگەر کەوتنە دەست خەنیمەکانیان لێیان تێنەگەن. کەوابوو هەڵبژاردەیەکیان لە پیتەکان لە ناو ئەلفبێی هەمەچەشنەی هاوسێیەکانیان وەرگرتووە کە لە زۆربەیاندا بەجێهێنانەکانیان گۆڕیووە یاوەکو لە گەڵ فۆرم و بەجێهێنانی خۆیان گونجاندووە کە ئەمە زۆر دەگمەنە. ئەوان خەمخۆری ئەوە بوون ئەو پیتانە کە لە ئەلفبێ هەمەچەشنەکاندا بێ خاڵن هەڵبژێرن بۆ ئەوەی نووسینەکانیان نیشانەیەکی تایبەتی جیاکراوە و گشتی بەسەرەوە بێ.

## XVII

### ئەلفبێی ئێزیدیەکان و ترەنسکریپسیۆنەکەی

ئێزیدیەکان برێك جار چوار پیت بە خاڵی نیشانە *puncta diacritica* دەنووسن، (ر) ی زۆر سووك لەگەڵ خاڵێك لە خوارەوە. (ل) ی قەڵەو لە گەڵ خاڵێك یا وەکو لەگەڵ ددانەیەك[69] لە سەرەوە، *w* وو ی سوك لەگەڵ خاڵێك لە خوارەوە و (ل) ی زۆر سووك خاڵێك لە خوارەوە. بە شێوەیێك کە دەتوانین بڵێن هەموو جارێك کە بیانەوێ سووکی بکەنەوە بە خاڵێك بۆ خوارەوە جیای دەکەنەوە، لە کاتێکدا بە خاڵێك بۆ سەرەوە پیتی قەڵەو دیاری دەکەن، بێجگە لە (ل) ی قەڵەو نەبێ کە بە هێلێکی بچوکی پان جیادەکرێتەوە کە دەخرێتە سەر سەروو یا وەکو بە خاڵێك کە ئەویش دەکەوێتە سەرەوە. بەمشێوەیە دەبینین کە زۆر پێوەندی نیشانە لە ناو تێکستەکەدا دەبینرێ، نیشانەی ^ کە دەخرێتە سەر پیتێك نیشانەی ئەوەیە کە پیتەکە بە هەڵە نووسراوە.

---

[69] ددانە : dentelure

XVII° L'alphabet yézidite et sa transcription.

| Arabe | Transcription | Arabe | Transcription | Arabe | Transcription |
|---|---|---|---|---|---|
| ا | ʾ,a | ش | š | ن | n |
| ب | b | ص | ṣ | ه | h |
| ت | t | ض | ḍ | و | w,u |
| ث | s̱ | ط | ṭ | ي | y |
| ج | ǰ | ظ | ẓ | پ | p |
| ح | ḥ | ع | ʿ | چ | č |
| خ | x | غ | r̃ | ژ | ž |
| د | d | ف | f | گ | g |
| ذ | ẕ | ق | ḳ | ڤ | v, w |
| ر | r | ک | k | | |
| ز | z | ل | l | | |
| س | s | م | m | | |

ئەلفبێی کوردی نووسینی ئێزیدیاتی

# جیلوە[70]

1- یەکەمی هەموو ئافەریدەکان مەلیك تاوسە *Melek-Taûs*[71]. 2- هەر ئەویشیان بوو کە ئەبتاوس *Abtâus* هەناردە سەر ئەم دونیایە تا گەلە هەڵبژاردەکەی خۆی پەروەردە و ڕێنوێنی بکات و لە لادان و هەڵە ڕزگاریان بکات. 3- هەوەڵجار بە زار و دواتر لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە کە ناوی (جیلوەیە) *Jelweh* ئەو کتێبەی کە هیچ بێگانەیەك بەم ئایینە نابێ بیخوێنێتەوە.

## بەشی یەکەم

1- من بووم، منم و تا هەتا هەتایەش هەر دەسەڵاتم بە سەر ئافەریدەکان و بەڕێوبردنی بەرژەوەندی و کاروباری هەموو ئەوانەوەیە هەیە کە لە ژێر دەسەڵاتی مندان. 2-هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە منە و لە تەنگەتاویدا هانام وەبەردێنن بە پەلە بە هانایانەوە دەچم. 3- من لە هەموو شوێنێکدا هەم. من دەستم لەناو هەموو ئەو ڕوداوانەیە کە بێباوەڕەکان پێیان دەڵێن ( خراپەکان) هەر تەنها لەبەر ئەوەی لە گەڵ حەزی ئەوان یەکناگرێتەوە. 4- بە گوێرەی فەرمانی من هەموو سەردەمانێك سەرداری خۆی هەیە و

---

[70] وەرگێڕانێکی زۆر ئازادە و لە ڕووی نوسخە عەرەبییەکەوە کراوە بە فرانسی، بڕوانە لاپەرەکانی 8 و 10 ( مەبەست لە لاپەڕەی چاپە فرەنسییەکەیە و لاپەرە کوردیەکانی بەرامبەر لاپەرەکانی 61-68 ی ئەم کتێبەی بەردەستتان دەوەستێ، وەرگێڕ)

[71] ژمارە دانانەکان لە لایەن ئیدیتۆری (گۆوارە فرەنسییەکەوە) خراونەتە ناو تێکستەکە.

هەموو نەوەیەك لەوەی پێش خۆی جیاوازە. سەرداری ئەم جیهانە و هەموو سەردارەکانی دیکەش هەر یەکەیان بە کاتی خۆی دوای ئەوەی ئەرکی خۆیان بەجێدەهێڵن دەگۆڕێن. 5- ڕێگەم بە سروشت داوە دروستکردنی ئەوانە تەواو بکات کە ڕێك دەبن لە گەڵ هەموو دادوەریەکدا. 6- ئەوەی بە پێچەوانەی من بجولێتەوە جگە لە پەشیمانی و خەم هیچی تری بۆ نامێنێتەوە. 7- خوایەکانی دیکە بە هیچ شێوەیەك دەست ناخەنە ناو کاروباری منەوە و ناتوانن بە هیچ کلۆجێ ڕێگەی ئەوەم لێبگرن کە من دەیکەم. 8- ئەو کتێبانەی کە دەکەونە دەست ئەوانەی بێگانەن بە ئاینەکەم ( ئاقیدەکەم) هیچ ڕەسەنایەتیەکیان نامێنێ و پێغەمبەر نەینووسیوون. ئەم بەدبەختانە خۆیان گومرا کردووە و ئاستەنگیان بۆ خۆیان هێناوەتە پێش. ئا بەمشێوەیە هەریەکە لە پێغەمبەرەکانیان ئەوەی پێغەمبەرەکەی پێش خۆی بونیاتی ناوە دەڕوخێنێ[72]. 9- لەو لای دیکە درۆ و ڕاستی بە ئاقیکردنەوە دەردەکەوێ. 10-سزایەکانی من بۆ ئەو کەسانەن دژی من قسەدەکەن، ئەگەرچی زانا بن لە هەموو شتێکیشدا. چەند شتێکم پاراستووە.داکۆکی لە چەند کارێك دەکەم هەمووی لە کاتێکی دیاریکراو و بە شوێنی خۆیدا. 11- ئەوانەی بە شوێن ئاقیدەی منەوەن ڕێنوێنیان دەکەم و دەیانخەمە سەر ڕێگەی ڕاست و ئەوانەی کە کە گوێڕایەلیم دەکەن چێژێکی تەواو لە پرەنسیپەکانی من وەردەگرن.

---

[72] ئەم ڕستەیە لە گەڵ ڕستەی پێش خۆی ناگونجێ، پێم وایە ناتەواویەك لە تێکستەکەدا هەیە کە نازانم داخۆ لە تێکستە ئەسلیەکەشدا وایە یان نە؟ وەرگێری کوردی.

## بەشی دووەم

1- من بە گوێرەی زانیارییەکانی خۆم هەموو مرۆڤێک سزا و پاداشت دەدەمەوە. 2- هەموو ئەوانەی لە زەوی ، ژێر زەوی و لەسەر زەویدان لەژێر دەسەڵاتی مندان. 3- ڕێگە بە پێکدادهەڵپرژانی ئینسانەکان نادەم. 4- دژی خێر و چاکەیان ڕاناوەستم، بە تایبەت ئەگەر ئەم چاکەیە بە ئازانجی ئەوانە بێت کە بێ یەک و دوو گوێڕایەڵیم دەکەن. 5- بەرژەوەندیەکانم بەوانە دەسپێرم کە تاقیم کردونەتەوە و دەزانم لە گەڵ حەزەکانی مندا یەکن. 6- بەمشێوەیە یان بە شێوەیەکی دیکە خۆم بۆ ئەوانەی باوەڕدارن یا ئەوانەی بە گوێرەی قسەکانی من دەجولێنەوە وەدیار دەخەم. 7- ئەوە منم دەبەخشم و وەردەگرمەوە، ئەوەی کە دەوڵەمەند دەبێ و ئەوەی کە هەژار دەبێ، ئەوەی کە دەبێتە خۆشحالی ئینسانەکان و ئەوەی دەبێتە هۆی سیاچارەییان، بەڵام ئەوانە هەموویان پێبەستن لە گەڵ ڕەوش و کاتدا. 8- هیچ کەس هەقی ئەوەی نییە دەستبخاتە ناو کارەکانی من، هەروەک چۆن هەقی بەرەنگاریبوونەوەشیان نییە. 9- ئەخۆشی ودەرد و بەلا infirmités بۆ ئەو کەسانە دەنێرم کە گوێڕایەلیم ناکەن. 10- ئەوانەی هەوڵدەدەن من ڕازی بکەن وەکو خەڵکی ئاسایی نامرن. 11- ڕێگە بە هیچ کەس نادەم ماوەیەکی زۆرتر لەوە بژی کە بۆم داناوە، هەڵبەت ئەگەر پێم وابێ شیاوە

دەتوانم بە پۆشاکپۆشی[73] ( دۆنا و دۆن) métempsycose دوو یا سێجار بینێرمەوە سەر زەوی.

## بەشی سێیەم

1- من بە بێ کتێب، بەڵام بە شێوەیەکی نادیار، هاوەڵ و باوەڕدارەکانم ڕێنوێنی دەکەم بۆ سەر ڕێگەی ڕاست. ئامۆژگاریەکانم بێ وەستان هەمیشە لە گەڵ ڕەوشەکاندا ڕێك بوونە. 2- هەموو ئەوانەی دژی من دەجولێنەوە لەو دونیای دیکە سزایان دەدەم. 3- ئەوەی ئادەم ئەوەیان لە بیرچووە کە لەودیو گۆڕەوە چیان بۆ ئامادەکراوە بۆیە کاتی زۆری خۆیان بە هەڵە وەسەردەبەن. 4- هەموو شتێك دەوەستێتە سەر من، ئاژەڵانی سەر زەوی، باڵندەکانی ئاسمان و ماسییەکانی ناو زەریایەکان، هەموو ئەم بوونەوەرانە لە ژێردەستی مندان. 5- هەموو گەنجینە و خەزێنەکانی ژێر زەوی لای من ناسراون و تەنها بۆ ئەو کەسەی منی دەوێ ناوە ناوە ئاشکرایان دەکەم. 6- پەرجوو وئاجباتیەکانم بۆ ئەوان وەدیاردەخەم کە قەبووڵی دەکەن و داوای دەکەن. 7- بێباوەڕەکان کە دژی منن یاوەکو خۆیان وەکو خەنیمی من بەدیاردەخەن، هەر تەنها

---

[73] پۆشاکپۆشی:métempsycose زیندووبوونەوەی ڕۆحی مردووێك لە ڕۆحێکی دیکە و خۆنیشاندانی بە پۆشاکێکی دیکە، ئەم وشەیە لە ناو ئەهلی هەقەکاندا تەواو بەرامبەر وشەی ( دونا و دون) دەوەستێ، وەرگێر.

زیان بە خۆیان دەگەیەنن و لەوە بێ ئاگان کە من گەورەیی و سامانم هەیە و لە ئەوەی ئادەم تەنها بەوانەی دەبەخشم کە شایانن. ڕێکخەری دونیایەکان، وەرچەرخانی ئەوەکان و گۆڕانی کارگێڕییان هەر لە دەورانی ئەزەلەوە éternité لە لایەن منەوە ڕێکخراون.

## بەشی چوارەم

1- مافەکانی خۆم بە هیچ یەکێك لە خوداوەندەکانی دیکە نادەم. 2- چوار ڕەگەز، چوار وەرز و چوار ئەستوون ( چوار گۆشەی دونیا) بۆ ئاتاجەکانی بوونەوەرەکان دروستکراون. 3- کتێبی بێ باوەڕەکان، ئەو بەشانەی کە لەگەڵ یاسایەکانی مندا گونجاو و ڕێك بوون وەریانبگرن و ئەو بەشانەش کە ناگونجێن ئەوە لە هەڵبەستنی خۆیانە 4- سێ شت هەن دژی منن و ڕقیشم لە سێ شتی دیکەیە. 5- ئەوانەی ڕاز و نهێنیەکانی من دەپارێزن پاداشتیان دەدەمەوە. 6- ئەوانەی بە حەوسەڵەوە ئازار و مەینەتیەکانی ئەم جیهانە دەچێژن، درێغی ناکەم لە پاداشت دانەوەیان لە یەکێك لە جیهانەکانم. 7- پێم خۆشە هەموو باوەڕدارەکانم بە یەکەوە یەکبگرن تا دژی بێگانەکان بوەستنەوە. 8- هۆ ئەو کەسەی بە شوێن ئامۆگارییەکانی منەوە چوویت، هەموو شتێك کە گونجاو نییە لە گەڵ یاسایەکانی من وازی لێبهێنە، خۆ وەدوور بگرە لە ناوهێنانی من یا ئیشارەکردن بە ئاکارەکانی من بۆ کەسێکی غەیرە، لە ترسی ئەوەی

ئەوەکا گوناهێك بکەیت، چونکە ئێوە نازانن کە بێگانەکانی ئایینەکەم و ئاقیدەکەم چی دەکەن.

## بەشی پێنجەم

1-تا ئەو جێگەیەی دەکرێ پیرۆزی بە کەسایەتی و وێنەی من ببەخشن، چونکە ئەوەی چەندین ساڵە دەیکەن وەبیرتان دەخاتەوە.
2- گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانم بکەن و گوێ لە سەرۆکە ئاینییەکانم بگرن، چونکە ئەوانەن کە رێنوێنیتان دەکەن لە هەموو ئەوانەی نادیار و تایبەتن بە منەوە.

(کۆتایی کتێبی جیلوە)

## IIe PARTIE:

### Texte des deux livres sacrés.

کۆپی کتێبی جیلوه به ئەلفبێ ی کوردیی ئێزێدیاتی

1- هەوەڵجار خوا مرواریيەکی گەورەی سپی لە ڕاز و پەنهانی زاتی خۆی دروستکرد. دواتر باڵندەیەکی دروستکرد ناوی ئەنفەر *Anfer* بوو، مرواریيە گەورەکەی خستە سەر پشتی باڵندەکە و ماوەی چل هەزار ساڵ لەسەری نیشتەوە.

2-خودا لە یەکەم ڕۆژی یەکشەممەدا فریشتەیەکی بە ناوی عیزرایل دروستکرد، ئەو فریشتەیە ناوێکی دیکەشی هەیە ئەویش تاوس مەلیکە *Taus-Malek* و سەرداری هەموو فریشتەکانی دیکەیە.

3- دووەم ڕۆژ خوا فریشتە دەردایل *dardail* ی دروستکرد، کە شێخ حەسەنە.

4- سێشەممە ئیسرافیلی دروستکرد کە شێخ شەمسەددینە.

5-چوارشەممە لە نەبوونەوە فریشتە میکایلی دروستکرد کە شێخ ئەبوبەکرە.

6-پێنجشەممە فریشتە جوبرایلی *Gabriel* لە نەبوونەوە دروستکرد کە ئەویش سەجاددەدینە.

7- هەینی شامایلی دروستکرد کە لە لای ئێمە بە ناوی ناسرەددین ناسراوە.

8- شەممە تەنها نورایلی دروستکرد کە جگە لە فخرالدین کەسێکی دیکە نییە.

9- مەلیک تاوس کرا بە سەرۆکی باڵای هەموو ئەم فریشتانە.

10- دواتر خوا حەوت ئاسمان، زەوی، خۆر و مانگی دروستکردن.

11- فەخرەددین لە لای خۆیەوە، مرۆ، ئاژەڵ، باڵندە و ئاژەڵانی کێوی دروستکردن و خستیانە ناو گیرفانی جل و بەرگی خۆیەوە و

بەمشێوەیە بە هاوەڵی پۆلێك فریشتە لە ناو مرواریییە گەورەکە دەرچوو. دواتر دژی مرواریییەکە هاوارێکی گەورەی لێ هەڵسا و دەمودەست مرواریییەکە بوو بە چوار بەش. لە سینەیەوە ئاو دەرچوو و زەریای لێدروست بوو. ئەو دەمانە هێشتا زەوی خڕ و بێ درز بوو.

12- دواتر خوا شێوەی باڵندەی بە جوبرایل بەخشی و ناردی تا هەر چوار گۆشەی دونیای دانا. دواتر پاپۆڕێکی دروستکرد کە جوبرایل ماوەی سی هەزار ساڵ تێیدا مایەوە و پاشان لە لالش نیشتەجێ بوو. ئەویش بە شوێن خۆیەوە دژی زەوی هاواری کرد و زەوی ڕەق ڕەق بوو. زەوی رەقەڵان دەستیکرد بە لەرزین. ئەودەمە جوبرایل پارچەیەك لە مرواریییەکەی هەڵگرت و خستییە ژێر زەوی بۆ ئەوەی سەقامگیر بێ و پارچەیەکی دیکەشی خستە سەر دەرگەی ئاسمان بۆ رازاندنەوەی. لەم بەشەی مرواری بوو کە مانگ و خۆر هەڵاتن. پاشان ئەورەی مانگ و خۆری بە تۆزێك رازاندەوە کە لە لە پارچەکانی مرواریییەکەوە بوون و بوون بە ئەستێرەی گومەزی شینی ئاسمان. هەموو بە ئاسمانەوە هەڵواسرابوون.

13- هەر جوبرایل بوو کە دارودرەختی بە بەر و گژوگیای لەسەر زەوی رواند و هەر ئەویش بوو چیایەکانی هەڵنان بۆ ئەوەی زەوی پێ برازێنێتەوە. دواتر عەرشی لە سەر فەرشی شانازی دروستکرد.

14- ئەوکاتە سەرداری جیهان گوتی[74]: ( هۆ فریشتەکان، من ئادەم و حەوا Adame et Eve دروستدەکەم و دەیانکەم بە مرۆ

---

[74] ئایا مەبەست لەمە خودایە؟ – من نازانم مەبەست لە مەدا چییە. ئەگەر مەبەستی لە خوا بێ ئەوە جوبرایل نییە کە مرۆی دروستکردووە، هەر وەك کەمێك پێشتر باسکراوە، لەوانەیە مەبەست لەمە جوبرایل بێت، بەڵام بۆچی لێرەدا پێی دەڵێ سەرداری جیهان Souverain Maître

(بوونەوەن). لە وەچەی ئەوانەوە شەهر ابن سفر لە دایکبوو، کە نەتەوەیەکی لەسەر زەوی لێوە پەیدابوو. هەر لە هەمان ئادەم ، نەتەوەی ئیزرایل پەیدابوو و بەمشێوەیە میللەتی هەڵبژاردەی تاوس مەلیك، بە شێوەیەکی دیکە نەتەوەی ئێزدییەکان پەیدابوو.

15- پاشان شێخ ئادی بن موسافیر لە خاکی سوریاوە هات تا لە لالش نیشتەجێ بێ،

16- دواتر خوداوەند دێتە سەر چیای ڕەش، هاوار دەکات و دەمودەست سی هەزار فریشتە دروستدەکات، لەو فریشتانە سێ دەستەیان لێ دروستدەکات دەمودەست بۆ ماوەی چل هەزار ساڵ دەستدەکەن بە پەرەستنی. دواتر خوا دەیانداتە دەست مەلیك تاوس و هەڵیاندەکێشێتەوە بۆ ئاسمان.

17-پاشان خوا دابەزیە قودس Jérusalem و فرمانی بە جوبرایل دا کەمێك خۆڵ لە هەر چوارگۆشەی دونیا بهێنێ. جوبرایل گوێڕایەڵی دەکات. (با)، ئاگر و ئاوی تێکەڵ بە خۆڵەکە کرد و بەمشێوەیە هەوەڵین مرۆی دروستکرد و بە قودرەتی خۆی رۆحی پێبەخشی. خوا فرمانی بە جوبرایل دا تا ئادەم لەناو بەهەشت نیشتەجێ بکات. جوبرایل بەوشێوەیە ئادەمی لەناو بەهەشت نیشتەجێکرد. خودا رێگەی بە ئادەم دا کە بەری هەموو درەختەکان بخوات، بەڵام ئەوەی لێقەدەغەکرد دەست بۆ گوڵەگەنمان ببات.

18- دوای سەد ساڵاندا، تاوس مەلیك بە خودای گوت:

- ئادەم چۆن وەچە پەیدا بکات؟ وەچەکانی کامانەن؟

-خوا وەڵامی دایەوە: من هەموو شتێکم خستۆتە بەردەستی تۆ، چۆنت دەوێ ئاوا بکە)،

– ئەوکاتە تاوس مەلیك ڕووی لە ئادەم کرد و پێی گوت:
–ئایا گەنمت خواردووە؟
+ نەخێر، چونکە خوا لێ قەدەغە کردووم دەستی بۆ ببەم.
–بیخۆ چونکە ئەمە بۆ تۆ باشە.
هەرکە ئادەم گەنمی خوارد، سکی پەنەما. ئەوکات تاوس مەلیك کە ئەو ئامۆژگارییەی ئادەمی کردبوو چووە ئاسمان و ئادەمی بەجێهێشت.
19– ئادەم تەواو لە تاو ئازار هەراسان بوو و سکی پەنما بوو، ئەوەندە پڕ بوو بوو کە نەیدەتوانی بە هیچ شێوەیەك میز بکات. خوا (بەزەیی پێدا هاتەوە) و باڵندەیەکی دەنووك گەورەی بۆ هەنارد کە بە دەنووکی خۆی بە شێوەیەکی کارامە دەرووێکی لە شوێنێکی شیاو بۆ کردەوە. ئادەم یەکسەر ئارام بۆوە.
20– جوبرایل ماوەی سەد ساڵان لە ئادەم جیابۆوە و ئادەم خۆی خەمبار بینییەوە و ئەم هەموو ماوە دوور و درێژە هەردەگریا.
21–خودا فەرمانی بە جوبرایل دا حەوا دروستبکات. فریشتەی گوێڕایەڵی خوا لە باڵی چەپییەوە ژنی ئادەمی دروستکرد.
22– دوای ئەوەی ماوەی سەد ساڵان تەواو بوو. تاوس مەلیك لە ئاسمانەوە هاتە سەر زەوی بۆ ئەوەی سەرقاڵی میللەتی ئێمە بێ کە دروستیکردبوو. بەدەر لە پاشای کۆنی ئاشوورییەکان، ئەم پاشایانەی خوارەوەشی پێبەخشین: نەسرۆخ، بە وتەیەکی وردتر نەسرەددین، کامبیز یا فریشتە فخرالدین، ئارتیمۆس یان فریشتە شمس الدین.
پاشان بەمشێوەیە دوو شانشینی دیکە، شاپووری یەکەم و شاپووری دووەمی پێبەخشین کە لای ئێمە ناسراون و

حوکمڕانییەکانیان پێکەوە سەدو پەنجا ساڵ بوو و میرەکانی ئێمە ڕاستەوخۆ لەوانەوە کەوتوونەتەوە.

23- ڕقمان لە چوار پاشا دەبێتەوە[75].

24- ئەوانە ئەوانەن کە ئێمە قەدەغەیان دەکەین، سەرەتا خاس Laitue ، چونکە ئەوە ناوەکەی لە ناوی ژنە پێغەمبەری خاس[76]-مان دەچێ:

یەکەم: فاسۆلیا.

دووەم: ڕەنگی شین، بۆیە قەدەغەیە جل و بەرگی شین یا شتێکی بەم ڕەنگە بپۆشین.

سێیەم: لە بەر پیرۆزی پێغەمبەر یۆنان Jonas ماسی خواردن بە تەواوی قەدەغەیە.

چوارەم: ئاسک-یش هەروا بۆ ئێمە قەدەغەیە، چونکو ڕانە مەڕگەلی یەکێك لە پێغەمبەرەکانی ئێمەیە.

---

[75] لە هەردوو دەستنووسەکەدا هاتووە کە ئەوان ڕقیان لە چوار پادشایە، بەڵام ناوەکانیان ناڵێن. لەوانەیە ئەو پادشایانە بن کە زۆر ئازاری ئێزیدیەکانیان دابێ: خەلیفەکان یا پادشا تورکەکان بن.

[76] ئەم ژنە پێغەمبەرە کە ناوی خاستە یا خاسەیە کێ یە؟ من نەگەیشتمە ئەوەی ناوەکەی لەگەڵ هیچ ژنە پێغەمبەرێك بەو ناوە بناسمەوە. ئایا مەبەست لەمە کچی خوسەیە XUSS کە خەڵك پێی دەڵێن خایسس یا خاسیە؟ من زاتی ئەوە ناکەم ئەمە پشتراست بکەمەوە، چونکە ئەم کچە لە دەورانی پێش ئیسلامەتیدا تەنها بە داناییەوە بە ناوبانگ بووە نەك بە پاکیزەیی یان بە زوهدەوە. بەهەر حاڵ، بۆ مەبەستی چاکتر ناسینی کچی خوس ئەوە دەبێ تەنها نووسراوەکەی Dr. Perron, *les femmes arabes avant et depuis l'Islamisme*, pp. 41, 43-46 بخوێنینەوە.

